# نوێژ و پێویستیەکانی

ئامادەکردنی عبدالرحمن طه فتح المبین

# نوێژ و پێویستیەکانی

ئامادە کردنی


عبدالرحمن طه فتح المبین



لەسەر ئەرکی محمد حاجی ڕەشید موبرەیی ـ چاپ کراوە

١٤٠٦ ـ ١٩٨٦

بسم الله الرحمن الرحيم

قدْ افلحَ المؤمِنونَ ● الّذينَ همْ في صلاتِهِمْ خاشِعونَ ●
والّذِينَ همْ عنِ اللّغْوِ مُعْرِضُونَ ● والّذينَ همْ لِلزّكوةِ
فاعِلونَ ● والّذينَ هُمْ لِفُروجِهِمْ حافِظونَ ● إلاّ على ازواجِهِمْ
او ما ملكتْ أيمانُهمْ فانّهمْ غيرُ مَلومِينَ ● فمَنِ ابْتَغى
وَراءَ ذلِكَ فاُولئِكَ همُ العادُون ● والّذينَ هُمْ لِاماناتِهِمْ
وعَهْدِهِمْ راعُونَ ● والّذينَ همْ على صلواتِهِمْ يُحافِظونَ ● اُولئِكَ
همُ الوارِثونَ ● الّذينَ يَرِثونَ الفِرْدَوْسَ همْ فِيها خالِدُونَ ●

صدق الله العظيم

سورة المؤمنون

# پێشەکی

## بسم الله الرّحمن الرّحيم

**« إنّ الصّلاةَ كانتْ على المؤمنينَ كِتاباً مَوْقُوتاً »**

هەرچەندە ئەم نووسراوە شتێکی تازەنی یە کەخوێنەرانی خاوەن باوەڕ بەردەستیان کەوتبێ ، وە یەکەم جارنی یە کەڕۆڵە مسلمانەکانمان ئەم دیاری یە بەنرخەیان پێ گەیشتبێ ... وەدڵو دەروونیان پێ خۆش بەخت کردبێ !!.

لەبەر ئەوە بەدرێژایی ڕۆژگار پێنووس خەریکی ئەوەبێت باسی نوێژ بکات هێشتا هەرکەمە ، چونکەنوێژ گەورە ترین فەرمانی خوایەو کۆڵەکەی ئایینی پاکی ئیسلامە خاوەن بیرو باوەڕی پاك بێزاری دەر نابڕێ بەرامبەر بەو لایەڕانەی کەباسی نوێژیان گرتۆتە ئەستۆ هەروەکو چۆن لەشی ئادەمیزاد پێویستی بەخواردەمەنی هەیە وەبەبێ خواردن ناژیو گەشە ناکات ، هەروەها نوێژ کردنو باسی نوێژ خۆراکی گیانو دەروونە لەهەر کەسێکدا نەبێت ماناى وایە گیانو دەروونی ئەمرێتو لەجیهانی تاژەڵدا ژیان بەسەر ئەبات ، وەهەر پێنووسێکیش بەگوێرەی توانای خۆی باسی ئەم سەرچاوە بەنرخە پێشکەش ئەکات ، ئیتر جێگای ڕەخنە نی یە بۆ خوێنەرانی خۆشەویست وەهەر هەڵەیەكو ڕەخنەیەکی تیابوو ئومێدەوارم بەچاوێکی دڵسۆزانەوە سەیربکرێت وە لێی ئاگادار بکرێین .

پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی « رُفِعَ عَنْ اُمّتي الخطأ والنّسيان وما استُكرِهُوا عليه » .

لەسەر داخوازی هەندێ لەقوتابی یە تازە پێ گەیشتووەکان،وەدەست نەکەوتنی ئەو نامیلکانەی کەباسی نوێژیان تیانووسراوە دەستم کرد

بەنووسین لەبارەی نوێژەوە ، هیوادارم جێگای ڕەزامەندی خوابێ وەسوود بەخش بێت بۆهەموو خاوەن باوەڕێك بـەگشتی وەبەتایبـەتی ئەولاوانەی کەبەباوەڕێکی پۆڵایینیەوە ڕوو بەڕووی قوتابخانەکەی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەنگاویان هەڵگرتووە وەئەم دیاری یە بەنرخـە پێشکەش بێ بەهــەموو لاوێکی باوەڕ پۆڵایین کـەژیانیان تەرخـان کردوە بۆفێربوونی ڕێبازەکەی پێغەمبەری ئیسلام صلى الله عليه وسلم .

والسَّلامُ عليكم ورحمة الله وبركاته .

عبدالرحمن طه فتح المبين

سلێمانی مزگەوتی سەیوانی دووەم

# گرنگی نوێژ لەئایینی ئیسلامدا

لەئایینی خاوێنی ئیسلامدا گەورەترین پلەدراوە بەنوێژ ، ئەو ڕێزەی بۆنوێژ دیاری کراوە نەدراوەتە پایـەکانی تری ئایینی ئیسلام ؛ چونکـە بەندایەتی خوا بەبێ نوێژکردن سوودی نییـە ، خوای پـەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی « إنَّ الصَّلاةَ كانَتْ على المُؤمِنينَ كِتاباً مَوْقوتاً »(١) واتە : بەڕاستی نوێژ لە سەر مسلمانان فەرزێکە بەستراوە بەکاتی تایبەتییەوە پێویستییەکی تایبەتی مسلمانانە بەجێ هێنانی سوەله ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت: « فانْ تابُوا وأقامُوا الصَّلاةَ وآتَوا الزَّكاةَ فاخوانُكمْ في الدِّين »(٢) واتە : ئەگەر ئەو کافرە بێ باوەڕانە پەشیمان بوونەوە لەکوفرو بێباوەڕیو نەکردنی نوێژ،وەنوێژەکانیان بەردەوام کرد وزەکاتی مالی خۆیانیان دابەهەژاران‌و بێدەستان ئەوەلـەو کاتەدا ئەبن بەبراتان لەئایینی ئیسلامدا چوون یـەك ئـەبن وەبەئەندامێکی ئـایینی ئیسلام ژمارە ئەکرێن ـ٠هەندێ لەزانایانی ئیسلام ئەم ئایەتەیان کردووە بەبەلگە بۆکافر بوونی کەسانێك کەنوێژ بـەجێ ناهێنن وزەکاتی مـال‌و سەر وەکیان نادەن ٠٠ چونکە ئایەتەکە سێ مـەرجی سەرەکی تیـایە بۆ بوونی ئادەمیزاد بەئەندامێکی کۆمەلی موسلمانان ، هەرکەسێك یەکێ لەو مەرجانەی تیانەبێ بـەبرای موسلمان ناژمێرێ‌و بەریاسای ئایەتی ـ إنما المؤمنون إخوة ـ ناکەوێت ٠

وە ئەمەش مەرجەکانن :ـ

١ ـ تەوبەو گەڕانەوە لەتاوان وکردەوەی بێ سوود ٠

٢ ـ بەجێ هێنانی فەرزی نوێژ ٠

---

١ ـ سورة النساء ـ آية ـ ١٠٣ ـ ٠

٢ ـ سورة التوبة ـ آية ـ ١١ ٠

ـو٠٠٠هتد(٧) ٠

ئەمە هەمووی ڕای زانایان بوو بەرامبەر بەنوێژ نەکەر لەبەر ئەوەی نوێژ یەکەم فەرمانی خوایە دراوە بەسەر ئادەمیزاددا لە شەوی ـ میعراج ـ دا پێویست کراوەتە سەر موسڵمانان و شوێن کەوتووانی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ وە نەبێ نوێژ کردن هەر بۆ نەتەوەی پێغەمبەر و ئیسلام پێویست کرابێ بەڵکو قورئان تێمان ئەگەیێنێت کە نەتەوەکانی پێغەمبەرە پێشووەکانیش نوێژیان بووە جێگای ئەوەنی یە لێرەدا بەدرێژی باس بکرێت ٠ لە قورئاندا هاتووە لە سەر زمانی حەزرەتی ئیبراهیم داوای لە پەروەردگار کرد « رَبِّ اجْعَلْني مُقيم الصَّلاةِ وَمِنْ ذريتي »(٨) واتە : خوایە بمکە بەمرۆڤێکی نوێژ کەری ساغو هەندێ لەنەتەوەکانیشم ـوە هەروەها لەقورئاندا هاتووە خوای گەورە فەرموویەتی بە حەزرەتی مووسا : « إنني أنا الله لا إله إلا أنا فاعْبُدني وأقِمِ الصَّلاةَ لِذكري »(٩) واتە : ئەو

---

٧ ـ لە وانەیە خوێنەری بەڕێز بڵێت ئەی ئەوە نی یە قورئانی پیرۆز ئەفەرمووی « لا إكْراهَ في الدّين » واتە ـ زۆرە ملێ و زۆر کردن لە ئاییندا نی یە ـ ئیتر بە پێی ڕای زانایانی ئیسلام ئەم کوشتن و زیندان کردنە چی یە ئەگەر یەکێك نوێژ نەکات ؟ ئێمەیش ئەڵێین: ئەم ئایەتە بۆ ئەوانەیە کەهەر لەسەرەتاوە موسڵمان نەبوون ومیان لەسەر ئایینێکی تر بوون وەکو ئایینی گاورو جوولەکە بۆ ئەمانە زۆرە ملێ نی یە و زۆر یان لێ ناکرێت کەموسڵمان ببن بەڵکو ئارەزووی خۆیانە ئەو ئایەتەی سەرەوە بۆ ئەوانەیە کە بەپێی سەرئامە «دفتر النفوس» موسڵمانن و باب و باپیریان موسڵمان بووە و ئێستا لە ئایینی ئیسلام هەڵ گەڕاونەتەوە کەواتە هەڵگەڕاوەکان «المرتدّون» ئەوانەی کە بەربەرەکانی ئایینی ئیسلام ئەکەن بەر یاسای ئایەتی «لا إكراه في الدين» ناکەون ٠
لێرەدا زنایان مەبەستیان هەڵگەڕاوەکانە ٠

٨ ـ سورة ـ ابراهيم ـ آية ـ ٤٠ ـ
٩ ـ سورة ـ طه ـ آية ـ ١٤ ـ

نگایەی کە ئەکرێت بۆلای تۆ گرنگی یەکەی ئەمەیە کە بەڕاستی من ئەوخوایەم کەناوم ــ الله ــ یە کەس شیاوی پەرستن نی یە بێجگە لەمن ، مادام وایە بەندایەتی هەر بۆمن بکە وە بەتایبەتی ئاگاداری نوێژەکەت بکەو لەکاتی خۆیدا بەجێی بهێنە بۆ یادکردنی من وناو بردنی من هەتا فەرامۆش نەبن لە باسی من وە هەر وە هـا لـە قورئاندا هاتووە کـە حـەزرەتی ــ عیسا ــ نازو نیعمـەتەکانی خوا پێش چـاو ئـەخات وەئەفـەرمووێـت « وَجَعَلَني مُباركاً اينما كنتُ وأوصـاني بالصلاةِ والزكاةِ ما دُمتُ حَيّاً »(١٠) واتە : حەزرەتی عیسا فەرمووی پەروەردگارم پیرۆزی کردوم لە هەر شوێنێکدابم لەسەر زەوی یان لە ئاسمان وە فەرمانی پێداوم کـە نوێژ بکەم وەزەکاتی دارایی بدەم لەسەرەتاوە هەتا مردنم ٠

لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کەخوای گەورە پەیمانی وەرگرت لەبەنی ئیسرائیل یەکان بۆ بەندایەتی کردنیان کـە گـەورەترین خاڵی بەندایەتی یەکـەیان نوێژ کردن بوو هـەر وەکو خوای گـەورە ئەفەرموێت « وَإذ أخَذنا ميثاقَ بَني إسْرائيلَ لا تَعْبدونَ إلاّ الله وبالوالِدينِ إحْساناً وَذي القُرْبى واليَتـامى والمسـاكينَ وقولوا لِلنّاس حُسْناً وأقيمـوا الصّلاةَ وَآتوا الزّكاة »(١١) ٠

واتە : باسی ئەوکاتە بکە بۆ بەنی ئیسرائیل یەکان وە بۆموسڵمانانی کەلەکەت بۆ تێ گەیشتنیان لەحاڵی بـەنی ئیسرائیل یـەکانی سەردەمی حەزرەتی ــ مووسا ــ وە پەیمانیان لێ وەرگیرا کەبێجگە لەخوا بەندایەتی بۆکەس نەکەن ــ لا تَعْبُدونَ إلاّ الله ــ کەئێوە پەرستشی غەیری خوای جیهان ناکەن وە کردەوەی چاکـە بکـەن بەئەندازەی دەسەڵات لەگـەڵ باووکو دایکتانا وە لەگەڵ خزمانتاندا وە لەگەڵ منداڵی بێ باووکا «هەتیو»

---

١٠ ــ سورة ــ مريم ــ آية ــ ٣١ ــ
١١ ــ سورة ــ البقرة ــ آية ــ ٨٣ ــ

وەلەگەڵ هەژاران وبێ دەستاندا وە قسەی باش بکەن لەگەڵ ئادەمیزادا تابەشارەزایی کردنیان بۆ چاکە وە ئەونوێژەی پێویست کراوە لە سەرتان وەزەکاتی ئەو ماڵەی کە بڕیار دراوە بەسەرتانا لەسەر فەرمانی خوا بەجێیان بهێنن ٠

وە هەروەها لە قورئاندا هاتووە خوای گەورە ڕوو بەڕووی پێغەمبەری ئیسلامو گەلەکەی فەرموویەتی « وأمر اهلكَ بالصّلاةِ واصطَبِرْ عَلَيْها لا نَسئَلُكَ رِزْقاً نَحْنُ نرزقُكَ والعاقِبَةُ لِلتّقوى »(١٢) واتە : فەرمان بدە بەدانیشتوانی خانەدانی خۆت واتە فەرمانیان پێ بکە نوێژ بکەن بۆئەوەی هەمیشە پەیوەندیتان بە خواوە بێ ئەو نوێژانەش بکەن بەهۆیەك بۆ ڕووناك کردنەوەی دڵو دەروونتان وە خۆڕاگرتن لەکاتی گیرو گرفت «مشاکل»دا خۆت بگرە لەسەر نوێژ کردن لەشەوو ڕۆژداو لەگەرماو سەرمادا ، ئێمە ـ واتەخوا ـ داوا ناکەین ڕۆزی خۆت ودانیشتووانی خانەدانی خۆت بدەی ، بەڵکو ئێمە ڕۆزی تۆیش و ئەوانیش ئەدەین دڵی خۆت خالی بکە لە هەموو خەیاڵێك هەر فەرمانبەرداری خوا بکە ٠ وە بزانە کە ئەنجامی باش لە دونیاو لە پاشەڕۆژ «قیامة» هەر بۆ ئەوانەیە کە خۆیان ئەپارێزن لەتاوان وەئامادەن بۆ بەجێ هێنانی فەرمانەکانی خوا ٠

کۆتایی گوفتاری پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەگەڵ یارەکانیا ئەوە بووە کە فەرمانی پێداون بۆ پاراستنی نوێژ فەرموویەتی ـ الصلاة ـ الصلاة ـ هەر لەبەر ڕێزی نوێژ پێشەوای ئیسلام فەرمان ئەدا بەدایك و باوك و لێ پرسراوانی منداڵان بۆفێر کردنیان بەنوێژ لەتەمەنی حەوت ساڵیدا وە سەرزەنشتیان بکرێت لەتەمەنی دەساڵیدا وە لە جێگەی خەوتن

١٢ ـ سورة ـ طه ـ آية ـ ١٣٢ ـ

جیا بکرێنەوە « مروا صُبیانکم بالصّلاة لِسَبعِ سِنین ، وَاضربُوهمْ عَلیها لِعشرِ سنین. وَفرّقوا بَینَهُمَ في المَضاجِع » ، واتە: فەرمان بدەن بە منداڵە کانتان بە نوێژ کردن لە تەمەنی حەوت ساڵیدا وە لەتەمەنی دەساڵیدا سەرزەنشتیان بکەن لەسەر نوێژ واتە بیان ترسێنن بە لێدان بۆ کردنی نوێژ وە جیایان بکەنەوە لە جێگای خەوتندا

« ورد عن عبدالله بن عمر ـ رضي الله عنهما ـ أنّ النبيّ ـ صلى الله عليه وسلم ـ ذكر الصلاة يوماً ، فقال مَنْ حافَظَ عَليها كانت له نوراً وبرهاناً ونَجاةً يَومَ القيامة ومَن لم يُحافظ عليها لم تكن له نوراً ولا برهاناً ولا نجاةً وكان يوم القيامة مع قارون وفرعون وأبيّ بن خَلَفْ »(١٣) واتە : لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی باسی نوێژ ئەکرا ڕۆژێك لە خزمەتی پێغەمبەر دا ـ صلى الله عليه وسلم ـ پێغەمبەریش فەرمووی هەر کەسێك پارێزگاری نوێژ بکات ئەوا ئەو نوێژە ئەبێ بەڕووناکی و بەڵگە لەڕۆژی دواییدا وە ڕزگار بوونی خاوەنەکەی . وە ئەوکەسەی پارێزگاری نوێژ نەکات ڕووناکی و بەڵگە و ڕزگار بوونی بۆ نییە لەڕۆژی دواییدا وە لە پاشەڕۆژدا لەگەڵ قارون(١٤)

١٣ ـ رواه الامام احمد والطبراني .

١٤ ـ قارون یەکێك بووە لە هەژارانی سەردەمی ـ موسا ـ هات بۆ لای حەزرەتی ـ مووسا ـ لێی پاڕایەوە دۆعای چاکەی بۆبکات خواڕزق و ڕۆزی بداتێ ، حەزرەتی مووسا ـ زانیاری کیمیای ئەزانی قارونی فێرکرد قارون دەوڵەمەند بوو سەروەت و ماڵی گەیشتە پلەیەك ژمارە نەئەکرا وەکو قورئان بۆمانی باس ئەکات حەزرەتی مووسا ـ داوای زەکاتی لەقارون کرد بەڵام ئەو بەسەرانە ژمارەی کرد . خوا بردی بە قووڵایی زەویدا بەخۆی و ماڵ و سامانەکەیەوە .

و فیرعەون(١٥) ئوبەیەیی کوڕی خەڵەف(١٦) ئەبێ ـ وە ئیبن عەبباس ـ لەپێغەمبەرەوە ـ صلی الله علیـه وسلم ـ ئەڵێ « عری الاسـلام وقواعـد الدّین ثلاث عَلیهنَّ اُسسَ الاسلام مَن ترکَ واحدة مِنهُنَّ فهو بهـا کافرٌ ـ حلال الدّم ـ شهادة أن لا إلهَ إلاّ الله ـ والصّلواة المکتوبـة وصوم رمضان ـ »(١٧) واتە : داڕێژراوەو پاڵاوتەکراوە ئایینـی پاکـی ئیسلام لەسێ شتی سەرەکی ، بەو سێ شتە • دا مەزراوە ئایینی ئیسلام هەرکەسێك یەکێ لەمانە بەجێ نەهێنێ بێ باوەڕ «کافر» ئەبێت بەئایینی ئیسـلام :ـ

١ ـ ووتنی ووشەی شەهادەت

٢ ـ خوێن ڕشتن بەناڕەواو بەحە ڵاڵی بزانێ

٣ ـ نوێژە فەرزەکان و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان

هەرکەسێك یەکێ لەم سێ بنچینە ئایینیەی تیا نەبێت بەموسڵمان نادرێتە قەڵەم • وە هەروەها پێغەمبەر ـ صلی الله علیەوسلم ـ ئەفەرموێ: « لیس الایمانُ بالتمنّي ولکن ما وقر في النفس وَصَدَّقَهُ العمل وَإن قوماً غَرَّتهم الأماني حتی خرجوا من الدنیا ولا حسنة لهم ، وقالوا نحنُ نحْسِنُ الظَنَّ بـالله تعـالی ، وکَذبُوا لَو احسَنوا الظـنَّ لاحسنوا العمل »(١٨) واتە : باوەڕ بە ئاوات خواستن نایەتـەدی باوەڕ بریتییـە لەوەی کـە جێگیر بێت لـەدڵ و دەروونداو کردەوەش نیشانەی ڕاسـتی

---

١٥ ـ فیرعەون کابرایەکی ستەمکاربووە داوای خوایەتی کردوە •

١٦ ـ ئوبەیەیی کوڕی خەڵەف ئەڵقە لـەگوێ یەکی کافرەکانی سـەردەمی پێغەمبـەر بووە ـ صلی الله علیـه وسلم ـ زۆر ئازاری پێغەمبەرو یارانی داوە •

١٧ ـ رواه ابو یعلي باسناد حسن •

١٨ ـ روی البخاري من حدیث انس مرفوعاً •

باوەڕە) هەندێك بیر و باوەڕێكی شەیتانی لێلیان هەیە پێی بـایی بوون بەنیازی ئەوەی كە بەبێ بەجێ هێنانی فەرمانی خوا ڕزگاریان ئەبێت لـە ڕۆژی دواییدا هیوایان ئەوەیە ئەڵێن ئێمە بیرو باوەڕێكی باشمان هـەیە بەخوا • ئەگەر فەرمانبەر داریشی نەكەین هەرلێمان ئەبوورێ، ئەگەر ئەمانە ڕاستیان بكردایە نەبیرو باوەڕە كەیاندا كردەوەی جوانیان ئەكرد یاسای خوایان چاودێری ئەكرد ، درۆ ئەكەن لە بانگـەوازە كـەیاندا وائەزانن فەرمانی خوا بە چاوەڕوانی لە خشتە ئەچێ و ئەگۆڕێ هەتا تووشی ڕۆژی ڕەشی خۆیان ئەبن ئەوكاتە تێ ئەگەن • ئەگەر كەسێك مووچە خۆربێت لە مەڵبەندێكا «دائرة» بەتەواوی فەرمان وكارەكەی خۆی بەجێ نەهێنێ ئایا مووچەی مانگانەی بۆدیاری ئەكرێت ؟ نە خێر !! چونكە كاری خۆی بەجێ نەهێناوە ، وە پـەیڕەوی یـاسای نەكردوە هـەرچەند بەبیرو باوەڕێكی بەتینەوە لەگـەڵ یاسـای ئیش كردنەكـەی بێت وە خۆشەویستی خۆی بەرامبەر بەمەڵبەندی كارەكەی پیشان بدات •

ئینجا بۆمان ڕوون بووەوە پاداشتی خوای گـەورە لەگـەڵ بـەجێ هێنـانی یاسا كـەیەتی كـەقورئانە ئەكا ئارەزوو بیرو باوەڕی ئادەمیزاد هەروەكو قورئان ئەفەرمووێ : « مَنْ عَمِلَ صالِحاً فَلِنَفسِهِ وَمَنْ أساءَ فَعَلَيها وَما رَبُّكَ بِظَلامٍ لِلْعَبِيد » ـ سـورة فصـلت ـ ٤٥ ـ ٤٦ ـ وە خوا ئەفـەرمووێ : « وَرَحْمَتي وَسِعَتْ كُلَّ شيءٍ فَسَأكتُبُها لِلَّذينَ يَتَّقُونَ وَيُؤتُونَ الزَّكاةَ والَّذينَ هُمْ بِآياتِنا يُؤمِنون »(١٩) واتە : لەوەڵامی حەزرەتی مووسادا خوای گەورە فەرمووی میهرە بانیم گووشادە هەموو كەسێك و هەموو گیان لەبەرێ ئەگرێتەوە ، كەم و كوڕی تێدا نی یە وە خوای گەورە فەرمووی بە حەزرەتی مووسا ئەو ڕەحمەتەم كەهەموو شتێك و هەموو كەسێك دائەگرێ بەتایبەتی ئەینووسم

١٩ ـ سورة الاعراف ـ ١٥٥ ـ ١٥٦

بەنووسینێ نـەگۆڕێ بۆ ئـەو کـەسانەی کەخۆیان ئەپارێزن لـە کوفرو گوناھو نافەرمانی پێغەمبەرو زەکاتی ماڵی خۆیان دەرئەکەن ئەیدەن بـە ھەژاران بەتایبەتی ئەو ڕەحمەتەی خۆم ئەنووسم بۆ ئـەو کەسانەی کـە باوەڕ ئەکەن بە ھەموو بەڵگەیێ کە نیشانەی بوونی من ئاشکرا ئەکەن وە بەڵگـەن لـە سـەر دەسەڵاتی من » وە خـوای گەورە لـەم فەرمایشت «حدیث»ی ـقودسی ـ(٢٠) دا ئەفەرمووێ « ما اقلَّ حَیاءَ مَنْ یَطمَعُ في جَنتّي بِغَیرِ عَمَلٍ ، کیفَ اجودُ بِرَحمَتي علی مَنْ بَخِلَ بِطاعَتي » واتە : چـەند کـەم حەیایە ئەو کەسـەی بەھیوای بـەزەیی وڕەحمەتی من بێ وە بە تەمای چوونـە ناو بەھەشت بێ بە بێ کردەوە و چاکە کردن ، چۆن ئەو کەسە خەیاڵی وا ئەکات کـە من ڕەحمـەتی خۆم گوشاد بکەم بۆی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کـەسە بـەخیل و ڕژد بێت بە فەرمانبەرداری من »

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لـەحەفتا شوێندا باسی گەورەیی نوێژ کردنی کردووە بگرە زیاتریش ، جا ھەرکەسێك نوێژ بەجێ نەھێنێ مانای وایە لە ڕۆژێکدا « ٥ × ٧٠ = ٣٥٠ » جار بێ فەرمانی خوا ئـەکات شەیتان یەك جار بێ فەرمانی خوای کرد لە بەزەیی خوا بێ بەش بوو جا وەرە کاکی نوێژ نەکەر ھەر ڕۆژی ٣٥٠ جار بێ فەرمانی خوا بکە !!

ئیتر خۆت و غیرەتت ئـەی ئەوکـە سـەی کـە دوورە پـەرێزی لەنوێژ کردن ٠

---

٢٠ ـ حەدیثی قودسی قسەی خوایە و ھی پێغەمبەر نی یە ٠

# چی پێویستە پێش ئەمەی دەست بکرێت

# بــە نوێــژ ؟

بەر لە دەست پێ کردنــی نوێژ چــەند مــەرجێــك پێویستە بــەبێ پەیرەوی کردنی ئەو مەرجانە نوێژ بەتاڵە ئەمانەش مەرجەکانن :ـ

١ ـ پاك و خاوێنی «الطّهارة» : کە بریتی یە لە پاکو خاوێنی لەش و جل و بەرگ و شوێنی نوێژ کردنەکە .

٢ ـ داپۆشینی عەورەت «ستر العورة» : عەورەتی پیاو لە ئەژنۆوە هەتا ناووکی داپۆشراوبێ نوێژەکەی دروستە ، بەڵام بۆ ئافرەت هەموو لەشی ئەبێ داپۆشرابێ بێجگە لەدەم و چاوو هەردوو لەپی دەستی « الرسغ » ئەگەر ئافرەتێك نوێژ بکات و بێجگــە لەوەی ناو برا موویەکی بەدەرەوە بێت یان بەرگەکەی تەنك بێت قەدەغەی بینینی لەش نەکات ئەوا نوێژەکەی بەتاڵە .

خوای پەروەردگار لــە قورئانی پیرۆزدا ئــەفەرمووێ : « وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاّ مَا ظَهَرَ مِنهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلى جُيُوبِهِنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ »(٢١) واتــە :ـ ئــەی پێغەمبــەری خۆشەویست بفەرموو بەو ئافرەتانەی کــە باوەڕیان هێناوە پارێزگاری چاویان بکەن لە تەماشا کردنی بێگانە وە عــەورەتی خۆیان بپارێزن لــە لەزەت وەرگرتنی ناشەرعی ، وە دەری نەخــەن بۆ تــەماشا کردنی بێگانە ئەو شوێنانەیان کە هۆی جوانی ئەوانە لــە هــەموو جۆرە خشڵێك کــە خۆیانی پێ جوان ئەکەن بێجگە لە وانەی کــە چاو پۆشی لێ کراوە وەکو

---

٢١ ـ سورة النور ـ آية ـ ٣٠ ـ

دەم و چاوو هەردوو دەست هەتا جومگەی نێوان دەست و باسك وەیا سەرپۆشەکەیان بگەیەنن بەبەرۆکیان بۆ ئەوەی مل و سنگیان داپۆشن دووبارە ئەڵێمەوە هەزی جوانی خۆیان دەرنەخەن بۆ بێگانە بێجگە لەوانەی کەچاو پۆشیان لێ کراوە وەکو مێرد،کانیان و باوکیان و کوڕیان و ... هتد .

٣ ـ کاتی هاتنی نوێژ «دخول وقت الصلاة» : پێش هاتنی کاتی نوێژ نوێژ کردن بەتاڵە هەروەها دوای تێپەڕ بوونی کاتیش .

٤ ـ ڕوو کردنە ڕووگە «إستقبال القبلة» : نوێژ ئەگەر ڕوو لە ڕووگە نەبێت یە بەتاڵ ئەژمێررێت بێجگە لەتاتی شەڕدا بەمەرجێك بۆی ڕێك نەکەوێت ڕوو بکاتە ڕووگەو دوای دابەستن ڕووی لە هەر کوێ بێت زیانی نی‌یە .

وە خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرمووێ « فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ المَسْجِدِ الحَرَام وَحَيْثُ مَا كُنتُم فَوَلُّوا وُجُوهَكُم شَطرَهُ»(٢٢).

واتە : لە هەر شوێنێکدا بوون ڕووی خۆتان هەڵسوڕێنن بۆ ـ مسجد الحرام ـ کەعبەی پیرۆز ماڵی خوا ، وە لە هەر وولاتێکدا بوون ئەی موسڵمانان هەر ڕووی خۆتان هەڵسوڕێنن بۆلای کەعبەی پیرۆز . وە هەروەها خوای گەورە ئەفەرمووێ « وَلله المَشْرِقُ والمَغرِبُ فأيْنما تُوَلّوا فَثَمَّ وَجْهُ الله »(٢٣) . واتە : خۆر هەڵات و خۆر ئاوا لەزەوی دا هەمووی بۆ خوایە واتە زەوی بەڵکو هەموو جیهان موڵکی خوایە . لە هەر شوێنێکدا ڕووی خۆتان هەڵسوڕێنن ڕوو بەڕووی ڕووگە.. ئەوە لەوێدا ئامانج لە ڕووکردنە لەڕووگە بەدەست دێت ئیتر وەنەبێ ڕووکردنە ڕووگە بەسترابێ بەوەوە، کەهەر لە مزگەوتابن .

---

٢٢ ـ سورة البقرة ـ آية ١٤٩ ـ ١٥٠ ـ
٢٣ ـ سورة البقرة ـ آية ـ ١١٥ ـ

# چوونە سەر ئاو

« اوْ جاءَ احدٌ مِنكُم مِنَ الغائِطِ » ـ المائدة ـ ٦ ـ

ئایینی بەرزی ئیسلام هەموو خاوێنی یەکی گرتۆتە ئەستۆ ، وە ئەندامەکانی بەپاك و خاوێنی پەروەردە ئەکات وە یاسای قەشەنگ و ڕێك و پێکی لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە داناوە بۆمرۆڤ هەر لەچوونە سەر ئاویەوە بیگرە هەتا چوونە ناوگۆڕی . لە ڕەویەی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیه وسلم ـ .

بۆ ئەو کەسەی کە ئەچێتە سەر ئاو پێویستە قاچی چەپیّ پێش بخات وە ئەم نزاو پاڕانەوەیە بخوێنێت :

« بسم الله اللهم اني اعوذ بك مِنَ الخبثِ والخَبائِثِ » .

واتە : بەناوی خوا وە . خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لە هەموو شەیتانی پیسی نێرومێ ـ وە دوای هاتنە دەرەوە پێویستە قاچی ڕاست پێش بخرێت وە ئەم سوپاس و ستاییشە بێنێت .

« غُفرانَك اللهم الحمد لله الذي اذهَبَ عنّي الاذى وعافاني » .

واتە : خوایە لێ بوردن لە تۆوە یە سوپاس و ستاییش بۆ ئەو خوایەی لای برد لەسەر من ناخۆشی وە تەندروستی پێ بەخشیم ، کەسێك کە لە ئەدەب خانەبوو نابێ یادی خوا بکات وە ناوی بەرێت وەیا کاغەزێکی پێ بێ یادکردنەوە و ناوی خوای لەسەر نووسرابێ. ئەبێ لەکاتی دانیشتنی دا هێزی لەشی بداتە سەر لای چەپی وەڕوو لەڕووگە نەکات لەدەشتا بیدا ، ئەگەر لەناو ئاودەست خانەدابوو زیانی نی یە ، پێویستە خۆی لەخەڵك دوور بخاتەوە بەگوێرەی پێویستی خۆی لەشی دەربخات وە واز لەدواندن و گفتو و گۆو خواردن بهێنێت .

قەدەغەیە لەئاییندا میزو پیسایی کردنە ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە وە هەروەها لەجێگەی کۆبوونەوەی خەڵکدا ، وە لەژێر داری بەرداردا وە

لەژێر سێبەری دار و درەختێکدا کــە خــەڵك لە ژێریدا بحەسێنەوە ، وە سوننەتە بۆخۆ پاك کردنەوە لەسەر ئاو دەست دەستی چەپی بەکار بهێنێ وە ئەبێ زۆر ووریایی بەکار بێنێ لەخۆ پاك کردنەوە لەمیزو پیسایی لەبەر ئەوەی کەنوێژە کەمان دروست بێ چونکە لــەسەر فەرماییشتی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ سزای قەبر پەیدا ئەبێ بەهۆی خۆ پاك نەکردنەوە لەکاتی خۆپاك کردنەوەدا ٠

« عن ـ ابن عباس ـ رضـي الله عنهما ـ انــه قال : مَرَّ النَّبيُّ ـ صلى الله عليه وسلم ـ بِحائِطٍ مِن حِيطان المدينـة او مكة فَسَمِعَ صَوتَ إنسانينِ يُعَذَّبانِ في قُبورِهِما فقال النبي ـ صلى الله عليـه وسـلم ـ يُعَذَّبـانِ ومــا يُعَذَّبــانِ في كبيـر ثـمَّ قـالَ كـانَ احَدُهُما لا يَستَتِرُ مِن بولِهِ وكـانَ الآخَرُ يَمشي بِالنَّميمَةِ ثُمَّ دَعا بجَريدَةٍ فكَسَرَها كِسرَتَينِ فوَضَعَ على كُـلُّ قَبرٍ مِنهُما كِسرَةً فَقيلَ لَه يـارَسول الله لِمَ فَعَلتَ هذا قـالَ ـ صلّى الله عليه وسلم ـ لَعَلَّهُ أنْ يُخَفَّفَ عَنهُما مالم تَيبَسا(٢٤) ٠

واتە : لــە ئیبن عــەباسەوە ـ ڕەزای خوایان لێبێت ـ ئەگێڕنەوە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ رابوورد بەلای دیوارێك لــەدیوارەکانی شاری مەدینەدا یان مەککەدا بیستی دەنگی دوو ئادەمیزاد لەقەبرەکەیاندا سزا ئەدران پێغــەمبەر ـ صلى الله عليــه وسلم ـ فەرمووی سزا ئەدرێن بەڵام سزاکەیان لەسەر تاوانی گــەورەنییە ، ئەوانــەی لەخزمەتیا بوون فەرموویان ـ بەڵێ ـ ئەی پێغەمبەری خوا پێغەمبەر ـ صلى الله عليەوسلم ـ فەرمووی یەکێکیان لــەبەرئەوە سزا ئــەدرێت خۆی خــاوێن نەکردۆتەوە لەکاتی میزکردنا ، ئەوی تریان قسە هێنەرو قسە بەربووە ، ئینجا داوای لقێ داری کرد بۆیان هێنا کردی بــە دووکەرتەوە هەر کــەرتێکی لەسەر قەبرێکیان دانا ، ووتیــان بەپێغەمبەر ـ صلى الله عليــه وسلم ـ بۆچی وات کرد ؟ فەرمووی بەهیوای ئەوەوە کــە سزاکەیان سووك بێت مادام تەڕایی لەم دوو لقەدا بمێنێت ٠

---

٢٤ ـ رواه البخاري

# غوسـل

یەکێکی تر لەبەشەکانی پاکو خاوێنی بۆبەجێ هێنانی نوێژ شتنی هەموو لەشە لەکاتی لەش گرانیدا خوای گەورە لەقورئاندا ئەفەرمووێ :

« إنَّ اللهَ يُحِبُّ التوّابينَ ويُحِبُّ المُتَطهِّرينَ »(۱) ٠

واتە : بـەڕاستی خـوای گـەورە خـۆشی ئـەوێن ئەوکەسانـەی کەئەگەڕێنەوە بۆلای ئەوو تەوبە لەگوناهیان ئەکەن ، وە خۆشی ئـەوێن ئەوکەسانەی کەخۆیان بەپاکو خاوێنی ڕائەگرن ٠ وەپێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسـەربێ ـ ئەفـەرمووێ « **الطُهُورُ شَطرُ الایمان** » واتـە : پاکو خاوێنی بەشێکی باوەڕە ـ

لەش گرانی « لەش پیسی » بەهۆی ئەمانەی خوارەوەیە :

۱ ـ هاتنەوەی شەهوەت ـ مەنی ـ بەهەرشێوەیەك بێت ٠

۲ ـ جیماع کردن «بەجێ هێنـانی ئیشی ژنو مێردایەتی» باثاویشی نەیەتەوە (غوسل) کردن هەرپێویستە ٠

۳ ـ مردن ٠ غوسلی مردوو پیاوو ژن تیایدا بەشدارن ، ئادەمیزاد چپیاوبێ چژن کاتێك مرد پێویستە بشۆررێن بێجگە لەشەهید بالەشیشی گران بێت شتنی ناوێ چونکـە ـ حەنزەلە ـ کەیارێکی پێغەمبـەربوو ـ درودی خوای لـەسەربێ ـ لەشەڕی ـ ئوحددا ـ شـەهید بوو لـەشی گرانبوو پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەربێ ـ فەرمووی « **رأیتُ الملائکة تغسِله** » واتە : چـاوم بەفریشتە کـەوت ئـەیان شت واتـە پێویست بە شتن ناکات ٠

٤ ـ ڕزگار بوونی ئافرەت لە خوێنی ـ حەیز ـ ئافرەت کاتێ ماوەی حەیزی دوایی هات ئەبێ خۆی بشوات ٠

٥ ـ کاتێك ئافرەت ڕزگار بوو لە خوێنی پاش مندال بوون ئـەبێ خۆی بشوات ٠

---

(۱) سورة البقرة ـ آية ـ ۲۲۱

٦ ـ ئەو ئافرەتەی کە منالی ئـەبی باخوێنیشی نەبێ هـەرپێویستە خۆی بشوات ٠

**مەرجەکانی غوسل :**

١ ـ هێنانی نیەت لەکاتێکدا کە ئاو ئەکات بەخۆیا واتە لەنیازی خۆیدا باوەڕی وابێ کەئەرکی لەش پیسی لەسەرخۆی لائەبات ٠

٢ ـ لابردنی هەموو پیسایی یەك بە لەشی یەوە ٠

٣ ـ گەیاندنی ئاو بە هەموو لەش ٠

**شێوەی خۆشتنی پێغەمبەر** ـ صلى الله عليه وسلم ـ :

**« عَنْ عائشةَ زوجـة النبي ـ صلى الله عليـه وسلم ـ أنّ النبيّ ـ صلى الله عليه وسلم ـ كانَ إذا إغتَسلَ مِنَ الجَنابَةِ بَدَأ فَغَسلَ يَديهِ ثمّ يَتوضّأ كما يَتوضّأ لِلصلاة ثمّ يدخِلُ اصـابعَهُ في المـاء فَيُخَلّلُ بها أُصولَ شعرهِ ثـمّ يَصُبُّ عـلى رأسِهِ ثلاثَ غُرَفٍ بِيَديهِ ثمّ يُفيضُ الماءَ على جِلدِهِ كُلّهِ »** ـ رواه البخاري ـ واتە : حەزرەتی عائیشة دایکی مووسلمانان هاوسەری پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی پێغەمبەری خوا کاتێك خۆی ئەشۆرد بۆ لەش گرانی دەستی پێ ئەکرد یەکەم جار دەستەکانی ئەشۆرد ، ئینجا دەست نوێژی وەك چۆن دەست نوێژی ئەگرت بۆنوێژ ، ئینجا پەنجەی پیرۆزی ئەخستە ناو ئاوەوە مووی لەشی پیرۆزی پێ تەڕئەکرد بەتەواوی ، ئینجا سێ مشت ئاوی ئەکرد بـەسەریا ، ئینجـا بەتـەواوی ئاوی ئەکرد بـە لـە شیدا بەشێوەیـەکی گشتی ٠٠ ووتنـی « **بسم الله** » سوننـەتە لە سەرەتای غوسلەوە هەروەها پێش خستنی لای ڕاست بەسەرلای چەپدا ٠

- **ئەو شتانەی کە قەدەغە کراون بە لەش پیسی یەوە**

١ ـ نوێژکردن : خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرمووێ « **فَانْ كُنتُم جُنُباً فاطّهروا** » ـ المائدة ـ ٦ ـ واتـە : هەرکاتێك دەستتان کرد بـە

نوێژکردن ئەگەر لە شتان گران بوو خۆتان بشۆن ٠

٢ ـ تەواف کردنی ماڵی خوا « کەعبەی پیرۆز » قەدەغەیە بە لەشی گرانەوە بکرێت ٠

٣ ـ خوێندنی قورئانو دەست پێوەدانی : خوای گەورە لە قورئانی پیروزدا ئـەفەرمووێ « لا یَمَسُّهُ إلاّ المُطَهَّرُونَ تَنزِیـلٌ مِنْ رَبِّ العـالَمِین » الواقعة ـ ٧٩ ـ ٨٠ ـ واتە : دروست نی‌یـە دەست بدرێت لەقورئان بێجگە لەوکەسانەی کـەخاوێنن چونکـە نێرراوی پەروەردگاری جیهـانە ٠

٤ ـ چوونە ناومزگەوت : قـەدەغـەیـە بـەلـەشی گـرانـەوە بـە هەرشیوەیەك بێت ٠

٥ ـ ڕۆژووگرتن : مەگەر یەکێ ئاوی دەست نەکـەوێت ئـەتوانێ تەیەمموم بکات هەتا ئاوی دەست ئەکەوێت ٠

## ● ئەو شتانەی کەقەدەغەکراون لەسەر ئافرەتی حەیز دارو منـداڵ بوو

١ ـ نوێژ کردن وڕۆژوو گرتن ٠

٢ ـ خوێندنی قورئانو دەست لێدانی ٠

٣ ـ چوونە ناو مزگەوتەوە ٠

٤ ـ تەواف کردنی ماڵی خوا (کەعبە) ٠

٥ ـ جیماع کردن : خوای گـەورە لـە قورئاندا ئەفـەرمووێ : « وَیَسئَلُونَكَ عَنِ المَحِیضِ قُلْ هُوَ أذیً فاعتزِلُوا النِّسـاءَ فِي المَحِیضِ وَلا تَقرَبُوهُـنَّ حَتـی یَطْهُرنَ فـاذا تَطَهَّرْنَ فاتُوهُنَّ مِـنْ حَیـثُ أمَرَکُـمُ اللهُ إنَّ اللهَ یُحِـبُّ التـوّابِینَ وَیُحِـبُّ المُتَطَهِّرِینَ »(٢٥) واتـە : ئـەی پێغەمبـەری خۆشـەویست پرسـیارت

---

٢٥ ـ سورة ـ البقرة ـ آية ـ ٢٢١ ـ

لێ‌ئەکەن دەربارەی حەیزی ژنان کە چۆنەو چی لێ پەیدا ئەبێ ، بفەرموو پێیان کەخوێنی حەیز شتێکی قێزاوی‌یـە دەی کەناربگرن لەژنـەکانتان لەکاتی حەیزدا نزیکیان مەبنـەوە بەجیماع کردن هـەتا خۆیان ئـەشۆن وغوسلی لـەش پیسی ئەکـەن جاکاتێ کەخۆیان پاك کردەوە بچنـەلایان جیماعیان لەگەل بکەن لەوشوێنەوە کـەخوا فەرمانی داوە بە ڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ئەوێت کەتەوبە ئەکەن لەگوناهو ئەو کەسانەش کە خۆیان پاك ئەکەنەوە لەشتی پیس‌و ناڕەوا ٠

## ● کورتەیەك لەباسی ئەوشتانەی کەپیسن

١ ــ هەرشتێك شل‌بێتو مرۆڤ سەرخۆش بکات بەپیس دائەنرێ لەلایەن ئاینی پاکی ئیسلامەوە وەك عەرەق‌و هەموو جۆرە خواردنەوەیەك کەژیری لـەدەست‌ئادەمیزاد بیسێنیتەوە ، خوای کاربـەجێ لـەقورئانی پیرۆزدا ئەفەرمووێ « إنّما الخَمر والمَيسر والأنصاب والأزلام رِجْسٌ » المائدة ــ ٩٠ ــ تادوای ٠

٢ ــ سەگ‌و بەرازو بێچووی هەردووکیان ٠

٣ــ مردارەوەبوو جگەلەئادەمیزادو ماسی‌و کوللـەوە هەموو خوێنێك٠ خوای گـەورە لـە قورئاندا ئەفەرمووێت « حُرِّمَتْ عَلَيكُمُ المَيتَةُ وَالدَّمُ وَلَحمُ الخِنزيرِ وَما أُهِلَّ لِغَيرِ اللهِ » واتە : حەرام کراوە لەسـەر ئێوە ــ ئەی موسلما نەکان ــ خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو وە خواردنی خوێن وە گۆشتی بەراز وە گۆشتی ئەو ئاژەلەی کە لەکاتی سەر بڕینیا بەناوی خواوە سەر نەبڕێ بـەلکو بۆ مەبەستێکی تر ئەو ئاژەلە سەر ببڕێ ٠

٤ ــ ڕشانەوە و کێم و زۆخ لەهەر لەشێك دەرچێ ٠

٥ ــ هەرچی لەپاش و پێشی ئادەمیزاد بێتە دەرەوە بێجگە لە ئاوی شەهوەتی ئادەمیزاد ئەمە پاکە ، میزی منداڵیش کـە خواردن نـەخوات

بەشیری دایکی بژێت پاکە • شیری ووشکی قوتوو بەخواردن ئەژمێررێت بەڵام ئەبێ منداڵەکە کوڕبێت ئەگەر کچ بوو هەرپیسە باخواردنیش نەخواتو پێویست بەشتن ئەکات بەڵام میزی منداڵێ کە کوڕبێت بەئاو لێ پرژاندن ئەو شوێنە پاك ئەبێتەوە •

٦ ـ شیری ئەو گیاندارەی کە گۆشتی ناخورێ بەپیس ئەدرێتە قەڵەم بێجگە لە ئادەمیزاد •

٧ ـ هەر پارچەیەك لە گیانداری زیندوو ببڕرێت بەپیس دائەنرێ پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووی « **مـا قَطَعَ مِنَ البَهيمة وَهيَ حَيَّةٌ فَهُوَ مَيْتَةٌ** » ـ ابو داود و ترمذی ـ ڕیوایەتیان کردوە ـ واتە : ئەو بەشەی لە ئاژەڵ جیا بکرێتەوە ئەگەر ئاژەڵەکە زیندوبێت بە مردارەوەبوو دائەنرێت • بەڵام خوری و موو ، و پەڕی ئەوانەی کە گۆشتیان ئەخورێت پاکن وە پێستی ئاژەڵی مردارەوەبوو پاك بکرێتەوە بە «دەباغ»(٢٦) بەپاك دائەنرێت « روی ـ ابن عباس ـ **ان رسول الله ـ مَرَّ على شاة ميتة فقالَ لِمَن حَولِه ـ هلاّ أخذتم اهابها فدَبَغتُمُوه فانتَفَعتُم به ـ** » واتە : پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ تێپەڕی بەلای ئاژەڵێکی مردارەوەبووە وە فەرمووی بە وانەی لە دەوریا بوون بۆچی سوود وەرناگرن لە پێستەکەی بە هۆی دەباغەوە(٢٧) •

---

٢٦ ـ دەباغ : شێوەیەکی تایبەتی یە بۆ پاك کردنەوەی پێست بەکار ئەهێنرێ بە هۆی دەرمانەوە •

٢٧ ـ لێرەدا کەباسی ئەو خواردنەو خواردنەوانە کرا کەپیسن مەبەستمان خواردنیان نی یە بۆ نمونە ئادەمیزاد و ماسی و کوللەی مردارەوە بوو کە بە پاك دائەنرێت مەبەستمان ئەوە نی یە کە گۆستیان ئەخورێت وەیان ئەوانەی کە پیسن ناخورێن،مەبەستی ئێمە لێرەدا ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی بپارێزێت لەم جۆرە شتانە کە لەشیان و جل و بەرگی بەریان نەکەوێت وەیان دەستیان پێوە نەدات ئەوەکو لەنوێژ بچێت کە شوێنێکی لەشی بەر ئەم پیسیانە کەوت پێویستە ئەو شوێنە بشۆررێت چونکە نوێژی نی یە •

● تەیـەمموم :

تەیەمموم لە ئاسان کردنی چەند یاسایەکی ئایینی پاکی ئیسلامە ·
« ما يُرِيدُ اللهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ» ـ المائدةـ واتە: خوای گەورە نایەوێ کە ئەرك «زەحمة» بخاتە سەرتان بە جۆرێك ئازارتان بدات بەڵام ئەیەوێ کە پاکتان بکاتەوە لە لەش‌پیسی و بێ دەست نوێژی وە ئەیەوێ دڵتان پاك بکاتەوە لە فەسادی پەنامەکی و چڵکی دەروونی وە خوای گەورە بەم یاسایانە کە دای ڕشتوون ئەیەوێ نیعمەت و بەخشینیشی خۆی تەواو بکات لەسەر ئێوە ئومێد هەیە کە ئێوەبن بە ئادەمیزادێکی ئەوتۆ کە سوپاسی خوا بکەن لەسـەر بەخشیشەکانی خوا کە لـە ئاینندا بۆی دیاری کردوون ·

چۆنیەتی تەیەمموم :

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرمووێ « وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ » ـ المائدة ـ ٦ ـ واتە : *ئەگەر نەخۆش بوون و نەتان* توانی ئاو بەکار بهێنن لەبەر هەر هۆیەك بێت وەکو نەخۆشی و سەرما و سۆڵە و گەشت «سفر» لەم کاتانەدا لـەشتان پیس بێ یـا بێ دەست نوێژ بن وە یاخود یەکێ لـە ئیوۀ لەسەر ئاو هاتـەوە بێ دەست نوێژ بوو یـا دەستتاندا لـە پێستی ئافرەتان و بێ دەسـت نوێژ بوون یـا جیماعتان کرد لە گەڵ یانا · ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت بۆ لابردنی بێ دەست نوێژی یا لەش پیسی ئەوا لەم کاتانەدا تەیەمموم بکەن بە گڵێکی پاك ··· بـە تۆزی گڵەکە وە دەست بێنن بـەدەم و چاوتانا و دەستتانا هەتا ئانیشکتان لەو گڵە پاکە بۆ لابردنی لەش پیسی و بێ دەست نوێژی تەیەمموم دروستە کە بریتی‌یە لـەوەی مرۆڤ دەست بدات بـە تۆزێکی

پاکدا و بێهێنێ بەدەم و چاویداو هەردوو دەستی داو قۆلیدا هەتا ئانیشکی . وە تەیەممومم لەبەر چەند هۆیەك ئەکرێت :

١ ـ نەبوونی ئاو : ئەگەر ڕێبوارێك بەڕاستی «یَقین» ئەیزانی کە ئاوی دەست ناکەوێت لەجیاتی غوسل یان دەست نوێژ تەیەممومم بکات دروستە . نوێژەکەی پێ ئەکات و پێویست بە گەڕان ناکات بە شوێن ئاودا ، ئەگەر گومانی بوو کە لەوانەیە ئاوی دەست بکەوێت پێویستە هەوڵی بۆ بدات و بۆی بگەڕێت .

٢ ـ بەکارهێنانی تەیەممومم لەکاتی نەخۆشی‌یەکدا یان برینێکدا کە ئەگەر ئاو بەکار بهێنێت تووشی زیان بێت یان درەنگ چاك بێتەوە یا ئەندامێکی ئاشکرای عەیبدار بکات ئەوا لەبەر ئەم هۆیانە ئەتوانێ تەیەممومم بکات با ئاویش هەبێت ، ئەگەر لەبەر ساردی ئاوو هەوا نوێژکەر نەیتوانی دەست نوێژ بگرێت بۆی هەیە تەیەممومم بکات بە مەرجێك لەلای ڕوون‌بێت ئەگەر ئاوەکە بەکار بهێنێ تووشی زیان نەبێت، چونکە فەرمایشتێکی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ هەیە دەربارەی ئەم حاڵی دووەمە کە ـ جابر ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ بۆمانی ئەگێڕێتەوە

**« عَنْ جابر ـ رضي الله عنه ـ قال : خَرَجْنا في سَفَرٍ فاصابَ رجلاً مِنّا حَجَرٌ فشجه في رأسه ثمْ احتلم فسال اصحابه : هَلْ تجدونَ لي رخصة في التيمم ؟ فقالوا ما نَجِدُ لَكَ رخصة وأنْتَ تقدِر على الماء فاغتسل ـ فمات ـ فلمّا قدِمْنا على رسول الله اخبر بذلِكَ فقال : قتلوه، قتلهم الله ، الا سَألوا إذا لم يَعْلَموا فانما شفاء العيّ السؤال إنما كان يكفيه ان يتيمم ويَعصر ، او يَعصِبَ على جُرْحِهِ ثم يَمسح عليه ويغسل سائر جَسَدِهِ »**ـ رواه ابو داود والدار قطني ـ واتە ـ جابر ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ فەرموویەتی ئێمە ڕۆیشتین بۆ گەشتێك «سَفر» یەکێ لە ئێمە بەردێك دای لەسەری بریندار بوو ئینجا لەشی پیس بوو

«احتلام» پرسیاری کرد له هاوڕێکانی ئایا ئاین ڕێگەم ئەدات تەیـەممەوم بکەم له باتی خۆشۆردنم ؟ وەڵامیـان دایەوە ووتیـان لەو بارەیـەوە هیچ ڕێگات نی یه وه تۆ ئـەتوانی خۆت بشۆیت به ئاو ، ئەویش خۆی شت و ـ مرد ـ ئینجا جابر ئەفەرمووێت کاتێك گەڕاینەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەم هەواڵەمان دایێ فەرمووی کوشتوویانە خوا بیانکوژێ ، بۆچی پرسیار ناکەن لەوەی کـەنایزانن ؟ دەرمـانی نەزانین پرسیار کردنە ، ئەو پیاوە ئەیتوانی تەیـەممەوم بکات بۆ برینەکەی ، یان برینەکەی تەڕ نەکردایە بەشتێك بیبەستایە وه ئەندامـەکانی تری لـەشی بشۆردایە ٠

٣ ـ هۆیەکی تر له هۆیەکانی بەکار هێنانی تەیەممەوم ئەوەیە کـە ئاو هەیە بەڵام ناتوانێ خۆی بگەیێنێت به ئاوەکە لەبەر ترسی دوژمن یان هەر هۆیەکی تر ، به مەرجێك بترسێ کە زیانی لێ ئەکەوێت له خۆی بێ یان له ماڵی ، جیاوازی نی یه ٠

٤ ـ کاتێك ئاو هەبێت بەڵام پێویستی پێی بێت بۆ خواردنـەوەی گیان لەبەرێکی ڕێز لێگیراو لەم کاتەشدا دروستە تەیەممەوم بکرێت د ست له ئاوەکە هەڵگرێ بۆ خواردنەوە ٠

## پایەکانی تەیەممەوم

ئەو شتانەی کە تەیەمموومیان پێ تەواو ئەبێ ئەمانەن :

١ ـ هەڵگرتنی گڵ ، به مەرجێك تۆزی هەبێت و خاوێن بێت ٠

٢ ـ نیەت هێنان واتە حـەڵاڵ کردنی نوێژ نـەك لابردنـی بێ دەسـت نوێژی ٠

٣ ـ پێویستە هێنانی نیەتەکە لەگەڵ هەڵگرتنی گڵەکەدابێت وه بەردەوام بێت هەتا هەندێك له ڕوخساری مەسح ئەکات ٠

٤ ـ ژمارەی دەست کردن بە ناو گلەکەدا و تۆز وەرگرتنەکە ، نابێ لە دوو جار کەمتر بێت یەکێکیان بۆ دەم و چـاوی ئـەوی تریان بۆ هەردوو دەستی هەتا ئانیشکی ٠

## ئەو نوێژانەی کە بە تەیەمموم ئەکرێن کامەیان گێرانەوەی ئـەوێت ؟

١ ـ هەر کەسێك نیشتە جێ بێت « واتە کۆچەر نەبێت » بـە تەیەمموم نوێژ بکات ئەوە ئەبێ کاتێ ئاوی دەست کەوت نوێژەکەی بگێڕێتەوە، هەروەها گەشتێکیش کە گەشتەکەی بەحەرام بزانرێ لـەیاسای ئیسلامدا لەو گەشتەدا نوێژی کرد بـە تەیەمموم ئەبێ نوێژەکـەی بگێڕێتەوە ٠

٢ ـ کەسێك تەیەممومەکەی لەبـەر ساردی ئاوو هەوابێت ئەوە ئـەبێ نوێژەکەی بگێڕێتەوە ، بەڵام ئەگەر لـەبەر گـەرمی ئاوەکـە بوو گێرانەوەی ناوێ چونکە سارد کردنەوەی ئاوی گەرم ئەرکێکی گرانە ئەو شوێنانەی کە پلەی گەرمایان تیابەتینە ٠

٣ ـ هەرکەسێك تەیەممومەکەی لەبەر نەخۆشی بێت کە قەدەغـەی بەکار هێنانی ئاو بکات لە هەموو لەشیا، یان لەیەك ئەندامی لەشیا ئەگەر ئەو پارچەیە بەسترابوو ئەوە گێرانەوە « قەزا »ی لـەسەر نی یـە مەگەر خوێن بە برینەکەوەبێت ئەگەر داپۆشەری بـەسەرەوە بوو ئەو پارچەیە سەرنج ئەدەین ئەگەر پارچە بریندارەکە یەکێك بوو لە بەشەکانی تەیەمموم کە بریتی یە لەهەردوو دەست هەتا ئانیشك لەگەل دەم و چاودا ئـەوە هـەمیشە گێرانـەوەی لـەسەرە چونکـە نەشۆردنەکەی تەواوە نە تەیەممومەکەشی تەواوە لەبەر داپۆشەرەکە٠ ئەگەر داپۆشەرەکە لەسەر پارچەکانی تەیەمموم نەبوو بەڵوک لەسەر

پارچەیەکی تری دەست نوێژ بوو وەك لەقاچدا بێ یان لـە سەردا بێ ، ئەگەر ئەو پارچەیە بەدەست نوێژەوە بەسترابوو گێرانەوەی ناوێت ، ئەگەر بە دەستنوێژەوە نەبـەسترابێ یان شوێنی زیاتری لەدەوروبەری برینەکە داگیر کردبوو ئەوە گێرانەوەی لەسەرە ٠

ئەبێ کاتێك کە تەیـەممەموم ئەکرێت بۆ پارچەیـەکی لـەش دەست نوێژەکە نۆرەی شۆردنی بێت نەك لەدوای دەست نوێژەکە ٠

بۆ نمونە : کەسێك دەستی ڕاستی برینداره ، ئەبێ لەپێشەوە دەم و چاوی بشوات ئینجـا نۆرەی دەستی ڕاستیەتی هـەرچی بـەشێکی لـەو دەستەی کەساغە بیشوات بێجگە لەبەشە برینداره‌کەی ئـەوە لـەوکاتەدا تەیەممومەکە ئەکات هەتا بەتەواوی دەستی ڕاستی مافی خۆی وەرئەگرێ ئینجا دەستی چەپی بشوات چونکـە ڕێك و پێکی لـەدەست نوێژدا لـە مەرجەکانی دەست نوێژە ٠

## تەیەممومم بەچی هەل ئەوەشێتەوە

١ ـ بە هەرچی هۆیەك کە دەست نوێژی پێ هـەل وەشێتەوە « بەتال ئەبێتەوە » تەیەممومیشی پێ هـەل ئەوەشێتەوە چونکـە تەیـەممومم جێگری دەست نوێژە ٠

٢ ـ دەست کەوتنی ئاو کاتێك تەیەممومەکە لەبەر نەبوونی ئاوبێت ٠

٣ ـ لا چوونی ئـەو هۆیانەی کـە بوونەتە هۆی تەیـەممومم کردن وەکو نەخۆشی‌یەکە یا ساردی ئاوەکە یا گەرمی ئاوەکـە بـەمانە تەیەممومم بەتال ئەبێتەوە هەرچەند لـە کتێبـە « فقهیە.کاندا باسی تەیەممومم بەدرێژی ڕوون کراوەتەوە بـەلام لێرەدا من بـە گوێرەی پێویست باسم کردوە » ٠

# دەست نوێژ گرتن

پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك پێش ئەوەی دەست بکات بە نوێژکردن دەستنوێژ بگرێ لە بەر ئەوەی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرمووێ : « **يا أيها الذين آمنوا إذا قمتم إلى الصلاة فاغسلوا وجوهكم وأيديكم إلى المرافق وامسحوا برؤوسكم وأرجلكم إلى الكعبين ، وإن كنتم جنباً فاطهروا** »[٢٨] واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە خاوەن باوەڕن بە ئایینی ئیسلام . کاتێ ویستتان هەڵسنەوە بۆ بەجێ هێنانی نوێژەکانتان ڕوخسار و دەم و چاوتان بشۆن کە لە پانایيدا نێوانی هەردوو گوێیە وە لە درێژیدا نێوانی ڕووانی مووی سەرتانە هەتاکۆتایی ئێسکی چەناکەتان ، لەپاش شتنی ڕوخسار دەستەکانتان بشۆن لەگەڵ ئانیشکتانا بە ئاوی تازە مەسحی سەرتان بکەن کەم بێ یان زۆر وە قاچەکانتان بشۆن هەتا ئەگاتە هەردوو قولەپێتان وە ئەگەر لەشتان پیس بوو بەهەر هۆیەکەوە بوو خۆتان بشۆن پێغەمبەری خۆشەویستمان ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێ : « **عن أبي هريرة ـ رضي الله عنه ـ قال : قال رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ لا تقبل صلاة من احدث حتى يتوضأ قال ـ رجل من ـ حضرموت ـ ما الحدث يا أبا هريرة ؟ قال : فساء أو ضراط** »[٢٩] واتە : ئەبی هورەیرە ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ ئەفەرموێت پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : وەرناگیرێت و دروست نابێت نوێژی کەسێك کە بەبێ دەست نوێژ بیکات هەتا دەست نوێژ نەگرێت ، پیاوێك کەخەڵکی شاری حەزرەمەوت بوو فەرمووی بە ئەبوو هورەیرە کامەیە بێ دەست نوێژی ؟ ئەویش وەڵامی دایەوە فەرمووی هەرچی لەپاش و پێش دەرچێ باهەوای

---

٢٨ ـ سورة ـ المائدة ـ آية ـ ٦ ـ

٢٩ ـ رواه ـ البخاري ـ

سووك و گرانیش بێت هـەر هۆی بێ دەست نوێژی یە ۰ ئەم ئایەت و فەرموودەیە بەڵگەن لەسەر ئەوە کـە پێویستە نوێژ بـەدەست نوێژەوە بکـرێت ۰

جێ بەجێ کردنی دەست نوێژ ئەکرێت بەدوو بەشەوە :

١ ــ فەرز : دەست نوێژ پێك نایەت بەهۆی ئەو فەرزەوە نەبێت ۰

٢ ــ سوننەت : ڕەوشتێکە کە پێغەمبەری پێشەوا لەدەست نوێژدا کردوویەتی بێجگە لە فەرزەکـە ، ئەگـەر سوننەتەکـە لەدەست نوێژدا نەکرێت ئەو دەست نوێژە بە بەتاڵ ناژمێررێت ، بـەڵام ئەگـەر فەرزەکە نەکرا ئەوا ئەو دەست نوێژە بە بەتاڵ دائەنرێ هەر وەکو لەمەو دوا لـە فەرزەکان و سوننەتەکانی دەست نوێژ ئەدوێین ۰ بـەڵام بێ گومان ئەبێ موسڵمان بەرامبەری ڕەوشتی پێغەمبەر لەگەڵ ئەم ئایەتە قورئانی یەدا بێ کـە ئەفـەرموێ « **وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا** » واتە : ئەوەی پێغەمبەر ــ درووددی خوای لەسەر بێ ــ بۆی هێناون و فەرمانتان پێ ئەدا ، وەری گرن وە ئەوەی قەدەغەتان لێ ئەکات وازی لێ بهێنـن : « **وَمَـا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُـوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى** »(٣٠) واتە : خوای گەورە سوێند ئەخوا بەو کەسەی کـە بەدی هێنـەری ئـەو شتە سـەر سوڕ هێنـەرانەی جیهـانە وەکو ئەستێرەکان و ۰۰.هتد

کە پێغەمبەر ــ صلی الله علیه وسلم ــ خاوەنی ئایینی پاکی ئیسلام و بانگە وازکەری ڕێگەی خوایە ۰ پیاوێکی هوشیار و بێ وێنەیە لە هەموو ڕوویێکەوە ، ئەو پێغەمبەرە چ لەووتاری پەیوەندیدار بـە بیر و باوەڕەوە چ لەووتاری پەیوەندی دار بەحەڵاڵ و حەرامەوە لە خۆیەوە قسە ناکا و چی ئەڵێ بەوەحی لەلای خواوە بۆی دێ و جوبرەئیل فێری ئەکات ۰

---

٣٠ ــ سورة ــ النجم ــ آیة ــ ٣ ــ ٤ ــ

# پێویستی «فەرزەکانی» دەستنوێژ

## « فرائِضِ الوُضُوءِ »

١ ـ نیەت : بە دڵ بڵێیت نیەتمە بۆ دەست نوێژی لەسەر خۆم لا ئەبەم ، وەیان بڵێی فەرزی دەست نوێژ بەجێ ئەهێنم ، ئـەم نیەتەش بەخەیاڵی دڵ ئەبێ ، پێویست ناکات بەدەم بووترێت چونکـە پێغەمبەری ئیسلام ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێ : **إنَّما الأعْمالُ بِالنيّاتِ وَلِكُلِّ امرءٍ مانَوى** » .

٢ـ شتنی دەم وچاو : کە لە پانیدا بریتی یە لە نێوان هەردوو گوێ وە لە درێژیدا نێوان جێگـەی ڕووانی مووی سـەر هەتا کۆتایی ئێسکی چەناگە . شتنی دەمو چاو لەسەرەتای دەست نوێژەوە پێویستە جێبەجێ بکرێت ؛ چونکە خوای گەورەلە قورئاندا فەرمانمان پێ ئەدا ئەفەرمووێت « **فاغسِلُوا وُجُوهَكُم** » لە پێشەوە واتای ئایەتەکەمان باس کردوە .

٣ ـ شتنی هەردوو دەست لەگەڵ ئانیشکا : شتنی دەست لەگـەڵ ئانیشکا فەرمانی قورئانی پیرۆزە و ڕوومان تێ ئـەکاتو ئـەفەرمووێت : « **وَأيدِيَكُمْ إلى المَرَافِقِ** » پیتی ـ إلى ـ لـەم شوێنە دا بەواتای ـ مَعَ ـ هاتووە ، واتە دەستەکانتان لەگەڵ ئانیشکا .

٤ ـ مەسحی هەندێك لەسەر : بریتی‌یە لەهێنـانی دەستێکی تەڕ بەسەر پێستی یان مووی سەردا ، ئەم دەست هێنانە بەسەردا بە شێکە لە پێویستی یەکانی دەست نوێژ ، دەست نوێژ بەبێ مـەسحی سـەر دانامەزرێ چونکە فەرمانی خوای گـەورەی لەسەرە ـ واتەفەرزە ـ کـە ئەفەرموێت « **وَامسَحُوا بِرُؤُسِكُمْ** » .

٥ ـ شتنی هەردوو پێ لەگەڵ هەردوو قاپی پێدا : چونکە فەرمانی خوای لەسەرە لە قورئاندا فەرمانمان پێ ئەدا بە شتنی هەردووپێ لەگەڵ هەردووقاپەکانی پێدا « **وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ** » ٠

ڕوون کردنەوەی ووشەی « أرْجُلَكُمْ » لەئایەتەکەدا ، هەندێك بڕوایان وایە لەباتی شتنی قاچەکان هەتا هەردوو قاپەکانیان بەواتای مەسح کردن دێت ، بەڵام لە ڕاستیدا وانیە وەك ئەوان لێی تێ گەیشتوون ٠ چونکە ووشەی « أرْجُلَكُمْ » لە ئایەتەکەدا بە سەرەی « فتحە »ی پیتی لامەکە ئەخوێنرێتەوە ئەو کاتە بە «مەنصوبی»واتە سەرەپێ دراوەیی ئەچێتەوە سەرووشەی « أیْدیکُمْ » لە ئایەتەکەدا « واتە مەعطوفە لەسەر ـ أیدي ـ ئەوکاتە فەرمانەکەی خوا بۆ شتنی قاچەکانە نەك مەسح کردنیان هەروەکو چۆن فەرمان دراوە بۆ قۆڵەکان هەتا ئانیشك پێویستە قاچەکانیش بشۆررێت » بەلای ئەوانەی کەمەسحی قاچەکانیان ئەکەنگوایا ژێرە « کسْرَة » ئەدەن بەووشەی ـ أرْجُلِکُمْ ـ عەطفی ـ ئەکەنەوە سەر ووشەی ـ رُؤسِکُمْ ـ بۆ ئەم بڕیارە هەڵەیە چوار وەڵام هەیە :

أ ـ کاتێك کەقورئان بەهەزارەها دانەی « نوسخە »ی لێ چاپ کراوە بەدەستی ئەوانەی کە مەسحی قاچ ئەکەن بۆچی ووشەی «أرْجُلَکُمْ» بەژێرە «کسْرَة» نە نووسراوە ؟

ب ـ ئەگەر لە کاتێکدا ووشەی « أرجُلَكُمْ »بەژێرە بخوێنرێتەوە «أرْجُلِکُمْ» ژێرەکەی «کَسْرەکەی»پێی ئەووترێ «جەڕەی جیوار» لەیاسای زمانەوانیدا بەهۆی ووشەی «برُؤسِکُمْ»وەری گرتووە ٠ ئەم شێوەیە لە ڕستەی « عَذابَ یَومٍ الیم » دا ڕووی داوە کە ووشەی ـ ألیم ـ ژێرەی پێدراوە لەگەڵ ئەمەشدا پێویستت وایە بۆری «ضَمَّە»ی بوایە کەچی بەهۆی ووشەی «یوم»ە وە ژێرەی وەرگرتووە ٠

ج ـ ئەڵێین : مەبەست لە ووشەی ـ أرْجُلَكُمْ ـ بە ژێرە بۆدەست هێنانە بەسەر «خووف»دا واتە ئەو گۆرەوییانەی کـە لەچـەرم دروست ئەکرێت. لە پێ ئەکرێن بۆ گەشت بۆ سێ ڕۆژ زیاتر، یا بۆ نیشتەجێ بۆ ماوەی شەوو ڕۆژێك لەیاسای ئیسلامدا بڕیار دراوە لەباتی شتنی قاچەکان مەسحیان ئەکرێت لە ـ عەبدوڵلای کوڕی عـەمرەوە ـ ڕیوایەت کراوە ـ « تخلّفَ عَنّا النَّبيُّ ـ صلى الله عليـه وسلم ـ في سَفرَةٍ سافَرْناها فادْرَكنا ـ صلى الله عليه وسلم ـ وَقَدْ أرْهَقَتْنا الصَّلاةُ وَنَحْنُ نَتَوَضّأ فَجَعَلْنا نَمْسَحُ على أرْجُلِنا فَنـادى باعلى صوْتِهِ ويْلٌ لِلأعقابِ مِنَ النّارِ مَرَّتَيْنِ أو ثلاثا »(٣١) واتە : ئەگێڕنـەوە لـە عەبدوولڵای کوڕی عەمرەوە فەرموویەتی جارێك پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ دواکـەوت لە ئێمـە لەگـەشتێکدا کـە لەمەککـەوە بۆ مـەدینە ئەڕۆیشتین لە ڕێگادا پێمان گەییشت ، وەکاتی نوێژی عەسر بەسەرماندا هات وەئێمە دەست نوێژمان ئەگرت لـە جیـاتی شتنی قاچمان مەسحمان ئەکرد بەسەر قاچماندا پێغـەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ بەمەی زانی بەدەنگێکی بەرز فەرمووی هاوار بۆ ئەو کەسانەی کە قاچەکانیان بەڕێكو پێکی ناشۆن لەکاتی دەست نوێژ گرتندا ـ ئەم فەرمووودەیـەی پێغەمبـەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ بۆمـان ئاشکرا ئـەکات کـە پێویستە قاچمان لەکاتی دەست نوێژگرتندا بەجوانی بشۆرین .

د ـ هەروەها فەلسەفە بەرزەکانـی دەسـت نوێژ پاكو خـاوێنی ئەندامەکانە خۆ ئاشکراشە کە قاچی مرۆڤ بەهـەموو ئەندامەکانی تری لەش زیاتر ئامادەیە بۆ پیس بوون . جا ئەگەر ئەندامەکانی وەك دەستو دەم وچاو پێویستیان بە شتن هەبێت چۆن ئەندامێکی وەکوقاچ پێویستی بە شتن نی‌یە ؟! وە ئەگەر بەمەسح کردن وازی لێ‌بهێنرێت ئەوکاتە ئەوتری

٣١ ـ رواه البخاري .

ئەندامی پیس ئەگەر تەربکرێت پیس‌تر ئـەبێت ! ئەمەش پێچـەوانەی ئایەتەکەیە ودژی ویستی ئیسلامیشە خۆ · بوونی ووشەی «إلى» وبوونی «غایە»ی وەك «الكعبين» لـە ئایەتەکـەدا بـەئاشکرا «عەطفی ارجلكم» ئەکاتەوە بۆ سەر «إلى المرافق» چونکە لە زمانی عەرەبیدا ڕستەی «مقید عەطف ئەکرێتەوە بۆ سەر ڕستەی مقید بەجارو مەجرور» ئەمانە هەمووی سەرنجدانی سونەتو کرداری پێغەمبەرو یارو یاوەرانی‌یەتی خۆ کردەوەی پێغەمبەر لە پەنامەیی‌یەکانی قورئاندا «شەرحو تەفسیرە»وە بـەتدایەتیش «العبادة» بەپێی ڕەئی‌و پێوان «الرأی والقیاس»نرخی تێدانی‌یە ·

٦ ـ یەکێکی تر لـەفەرزەکانی دەست نوێژ دوا بـەدوای یـەکـە «ترتیب» بـەوجۆرەی کـەباس کرا پـاش وپێش نـەخرێن بـەگوێرەی فەرمانەکانی خوا جێ بە جێ بکرێن چونکە خوای گەورە لەئایەتەکەدا یەکەم فەرنمان پێ ئەدا بەشتنی دەمو چاوی ئینجا دەستەکانمان هەروەها ··· هەتا کۆتایی دەست نوێژ بەم جۆرە ·

١ ـ «فاغسلوا وجوهـكم» ٢ ـ «وأیدیكم» ٣ ـ «وامسحوا برؤسكم» ٤ ـ «وارجلكم» :

ئەگەر بێ‌دەست نوێژێك غوسلی کردو خۆی نوقم‌کرد لە ئاوێکدا ئەوە دەست نوێژیشی بۆهـەڵ ئەگرێت با لـەناو ئاوەکەشدا ئـەوەندە نەمێنێتەوە کەخەیالی دەست نوێژگرتن بکات دوابەدوای یەك «تەرتیب»لە ویدا پێویست نی‌یە ·

## چەند وێنەیەك بۆ فەرزەكانی دەست نوێژ



( ١ )

«وێنەی چۆنیەتی شتنی دەم‌و چاو»



( ٢ )

وێنەی شتنی هەردوو دەستەكان لەكاتی دەست نوێژدا



( ٣ )

وێنەی مەسح کردنی سەر لەکاتی دەست نوێژدا



( ٤ )

وێنەی شتنی قاچەکان لەکاتی دەست نوێژدا

# سوننەتەکانی دەست نوێژ

١ ـ وتنی «بسم الله الرحمن الرحيم» ـ **البَسْمَلة** ـ لە سەرەتای دەست نوێژەوە چونکە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێ **« كُلُّ امْرٍ ذِي بالٍ لَمْ يُبْدأ بِـ ( بسم الله ) فَهُوَ ابْتَر »** واتە : هەموو کردارێك کەخاوەنی سوودو قازانج بێو خوا پێی ڕازی بێت ئەگەر سەرەتاکەی بەناوی خواوە «بسم الله»دەست پێنەکرێت ئەوا ئەو کردارە بێ خەیرئەبێت •

٢ ـ شتنی هەردوو دەست بەرلەوەی دەست بکرێت بەدەست نوێژەکە • پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێ « **إذا اسْتَيْقَظَ اَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلْيَغْسِلْ يَدَهُ قَبْلَ انْ يُدْخِلَها في وضُوئِهِ ، فَانْ اَحَدَكُم لا يَدْرِي اينَ باتَتْ يَدَهُ** »(٣٢) واتە : هەرکاتێ یەکێ لەئێوە لەخەو هەڵسا بادەستەکانی بشوات پێش ئەوەی بیانکات بەئاوی دەست نوێژەکەدا چونکە هەریەکە لەئێوە کەلەخەو هەڵسایە وە نازانێ دەستی لەچ شوێنێك شەوی بەسەر بردووە •

٣ ـ بەکار هێنانی سیواك : بەهەموو شتێك کەزبر بێت سیواك دەکرێت بێجگەلە پەنجەکانی دەست ، بەڵام ئەگەر داری ئیراك «الاراك»دەست کەوێت ئەوە زۆر باشترە چونکە بۆنێکی تایبەتی تێدایەکە میکرۆب ئەکوژێ ، بەکار هێنانی سیواك ـ حەفتا ـ سوودی هەیە لەکتێبەگەورەکاندا بەدرێژی باس کراوە ، بۆیە پێغەمبەری پێشەوامان ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی « **لَوْلا انْ اشُقَّ عَلَى اُمَّتي لأمَرْتُهُمْ بالسواكِ عِنْدَ كُلِّ وُضُوءٍ** »(٣٣) واتە : ئەگەر سیواك کردن زەحمەت نەبوایە لەسەر نەتەوەکەم واتە کۆمەڵی

---

٣٢ ـ رواه البخاري •

٣٣ ـ رواه البخاري •

مووسڵمانان ــ پێویستم ئــەکرد لــەسەر مووسڵمانان لــەگــەڵ هــەموو دەست نوێژێکدا ٠

٤ ــ ئاو لەدەم ڕادان : بەمەرجێك ئاودەم خاوێن بکاتەوە لەهەموو شتێك هــەروەکو پێشەوامان ــ صلى الله عليــه وسلم ــ ئــەفــەرمووێ : **« ما مِنكُمْ مِنْ احد يَقرب وُضوءَه ثـمْ يتَمَضمَض وَيَستنشِق ويستَنثر إلا خرجت خطايا مِن فيه وخياشيمه مع الماء »** ــ رواه مسلم ــ واتە : هیچ کەسێ نییە لەئێوە نزیکی دەست نوێژی بکەوێتەوە ئاولە دەم ولووتی ڕادا وە کونە لووتی پاك بکاتەوە بێجگە لەوە کەتاوانەکانی دەمو لووتی لەگەڵ ئاوەکەدا ئەشۆرێتەوە ٠

٥ ــ ئاو لەلووت ڕادان هــەروەکو لــەوفەرموودەیــەی پێشــەوەدا باسکرا ٠

٦ ــ دەست تێ خستنە نــاو ڕیشی پڕ بۆ ئــەوکەسانــەی کــەڕیش ئەهێڵنەوە چونکە پێغەمبەر ــ صلى الله عليــه وسلم ــ ئەفەرمووێ : « **إذا توضا احَدَ كفا مِن مــاء فادخله من تحت حنكه فخلل به لحيتــه وقالَ هكذا امــرني ربي »** ــ رواه ابو داود ــ واتە : پێغەمبــەر ــ صلى الله عليه وسلم ــ کاتێك دەستنوێژی ئەگرت مشتێك ئاوی هــەڵ ئەگرت ئەیدا بــەچەناگەیداو دەستی ئەخستە ناو ڕیشیــەوە وەفــەرمووی بــەم شێوەیە پەروەردگارم فەرمانی پێداوم ٠

٧ ــ دەست خستنە ناو پەنجەکانی دەستوقاچ ٠

٨ ــ مەسح کردنی هەمووی‌سەر چونکە پێغەمبەر ــ صلى الله عليه وسلم ــ هەندێك لەسەری مەسح کردوە ٠ جــاری واش بووە بەهەردوو دەستی مەسحی هەموو سەری کردوە لەپێشەوە دەستی پیرۆزی بەسەریا هێناوە هەتا کۆتایی ســەری بۆ پشتەوە ئینجــا دەستی گێڕاوەتەوە بۆ

پێشی سـەری ئینجـا دەستی لێ هـەڵ گرتووە جـاری واش هـەبووە هەندێکی سەری مەسح کردوە بەسەر مێزەرەکەیا بۆئەوەی ڕێگای ئەوانە هەبێ کەسەریان برینداره سوننەتی مەسحی هەمووی سەر بەجێ بهێنن چونکە ڕەوشتو کرداری پێغەمبەر ـ صلی الله علیـه وسلم ـ «تشریع» بووە بۆ مووسڵمانان ٠

٩ ـ مەسح کردنی هەردوو گوێچکە دیوی دەرەوەو ناوەوەیان ٠

١٠ ـ هەموو پارچەکانی دەست نوێژ سێ جار سێ جار بشۆررێت بەپێی ئـەم فەرموو دەیە « **انَّ رسول الله ـ صلی الله علیـه وسلم ـ توضـا ثلاثا ثلاثا ثم قالَ هکذا الوضوء فمَن زادَ علی ذلك او نَقَصَ فَقَدْ اسـاءَ او ظَلَم** » واتـە : پێغەمبـەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ڕەووشتی وابووە کـاتێك دەست نوێژی ئـەگرت سێ جار سێ جـار پارچەکانی دەست نوێژی ئەشۆرد فـەرمووی ئاوا ئـەبێ دەست نوێژ گرتن هەرکەسێك لەسێ جار زیاتر ئاو بەکار بهێنێ یاکەمتر لەسێجار بەڕاستی تووشی تاوانو ستەمکاری بووە ٠ بەڵام فەرموودەی تری هەیە کەپێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەربێ ـ جاری واش هەبووە دوو جـار ئەندامەکانی دەست نوێژی شۆردوە یان جـارێك شۆردویەتی بۆئەوەی ڕێگا هەبێ بۆ ئەو کەسانەی کە جارێ یان دوو جار ئاوبـەکار ئەهێنن لەبەر هەرهۆیەك بێت بەڵام هەرسێ جارەکە باشترە ٠

١١ ـ پێش خستنی لای ڕاست هەمیشە پێش لای چەپ « **عَنْ ام عطیة قالت : قالَ رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ لَهُنْ في غسلِ ابنته إبدَأنَ بمیامِنِها وَمَواضِعَ الوُضوءِ منها** » واتە : دایکی عەتیە فەرموویەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیـه وسلم ـ فەرمووی بـەو ئافرەتانەی کچێکی پێغەمبەریان ئەشت کەمردبوو٠٠دەست پێبکەن بەشتنی لەلای ڕاستەوەو شوێنەکانی دەست نوێژیەوە ٠

١٢ ـ هەموو پارچەیەکی دەستنوێژ بەباشی دەستی پیا بهێنرێت لەکاتی شتنیدا .

١٣ ـ شتنی پارچەکانی دەست نوێژ بەسەریەکەوە واتە بەینیان نەخات ، وەکردارێکی تر تێکەڵی دەستنوێژنەکات .

١٤ ـ زیاد لەئەندازەی پێویست شتنی دەمو چاو لەدەست نوێژدا «**إطالة الغرة**» وە هەروەها زیاد لەئەندازەی پێویست شتنی دەستەکانی وا لەئانیشك بەرەو ژوورتر بشوات «**إطالة التحجيل**» ـ ئەبی هورەیرە ـ فەرموویەتی « **إني سَمِعْتُ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ يقول : إنَّ أُمَّتي يَدْعُونَ يَومَ القِيامَةِ غُرّاً مُحَجَّلِينَ مِنْ آثار الوُضُوءِ فمَنْ إستَطاعَ مِنكم أنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفعَلْ** »(٣٤) واتە : ـ ئەبی هورەیرە ـ فەرموویەتی من بیستوومە لەپێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێت بەڕاستی گەلی موسڵمانانی من بانگ ئەکرێن لەڕۆژی دواییدا بەناوی «موحەجەلینەوە» واتە : ناو چاوو دەستو پێ ڕووناك ـ بەهۆی ئەوەوە کە لە دونیادا زیاد لە ئەندازەی پێویستیان شۆردووە لەدەستنوێژدا(٣٥) .

١٥ ـ زیادە ڕەوی نەکردن لەئاودا لەکاتی دەست نوێژدا ،لەئایینی ئیسلامدا قەدەغەیە بەکار هێنانی ئاو زیاد لە پێویست .

---

٣٤ ـ رواه البخاري .

٣٥ ـ لێرەدا /کەباسی شتنی زیاد لەپێویست ئەکەین مەبەستمان ئەوەنی یە کەئەندامەکانی دەست نوێژ لەسێجارزیاتر بشۆررێن بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە ئەو شوێنە لەبەشە دیاری کراوەکەی زیاتر بشۆررێن بۆنمونە شتنی دەستەکان هەتا ئانیشکە ئەگەر سەرووی ئانیشکیش بشۆررێت باشترەو سونتەتیشە یان قاچەکان هەتا قاپ ئەبێ بشۆررێن ئەگەر سەرووی قاپەکانیش بشۆررێت ئەوا باشترە ... وەهەروەها ئیتر هەروەکو لەفەرموودەکەی پێشوودا باسمان کرد زیادە ڕەوی و بەکار هێنانی ئاو زیاد لەپێویست قەدەغەیە .

١٦ ـ ڕووكردنه ڕووگه له‌كاتی ده‌ستنوێژدا ٠

١٧ ـ ووتنی «شه‌هاده‌ت» ونزاو پاڕانه‌وه لـه‌دوای تـه‌واو بوونی ده‌ست نوێژ ـ حـه‌زره‌تی عومـه‌ر ـ ڕه‌زای خوای لێبێ ـ ئه‌فـه‌رمووێ پێغه‌مبـه‌ر ـ صلى الله عليـه وسلم ـ فه‌رمووی « **مـا منكـم مِنْ احَدٌ يَتَوضأ فـَيسبغ ثمّ يقـول : اشهَدُ انْ لا إلهَ إلاّ الله وَاشهَدُ انّ محمداً رَسول الله ـ إلا فتحَت له ابواب الجنة الثمانية يدخل من ايّها شاء** »(٣٦) واته : هیچ كه‌سێك نی‌یه له‌ئێوه ده‌ست نوێژێكی ڕێكو پێك بگـرێت لـه‌دوای ده‌ستنوێژه‌كـه‌وه شایـه‌تی بدا بـه‌تـه‌نیـایی خـواو پێغه‌مبه‌رایه‌تی پێغـه‌مبه‌ر ، ئه‌وه‌نه‌بێ هـه‌رهه‌شت ده‌رگاكانی به‌هه‌شتی بۆئه‌كرێته‌وه له‌هه‌ركامیانه‌وه ئاره‌زووی لێبێ ئه‌ڕواته‌ژووره‌وه ٠

سوننه‌ته له‌دوای ده‌ست نوێژو دوای ووتنی « **اشهد ان لا إله إلا الله وَحْدَهُ لا شـَريكَ لـه واشـهد أن محمـداً عَبْدُهُ وَرَسولُه** » ئه‌م نزاو پاڕانه‌وه‌یه‌ش بخوێنرێت : « **اللهمَّ اجعَلني مِنَ التوّابينَ وَاجعَلني مِنَ المتَطهريـنَ سُبْحانَكَ اللهمَّ وَبِحَمْدِكَ اشهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ انتَ استغفرك وأتوب اليك** » ـ رواه البخاري ـ واته : خوایه بمكێڕی له‌و كه‌سانه‌ی كه‌ته‌وبه ئه‌كه‌ن وه له‌وكه‌سانه‌ش كـه پاكو خاوێنن ، پاكو خاوێنی بۆتۆیه ئه‌ی په‌روه‌ردگاری من له‌گـه‌ڵ سوپاس‌و ستاییش شایه‌تی ئه‌ده‌م كه هیچ په‌روه‌ردگارێ نی‌یه كه شیاوی به‌ندایه‌تی بێ بێجگه له‌تۆ ، داوای لێبوردنت لێ ئه‌كه‌م وه‌بۆلای تۆ ئه‌گه‌ڕێمه‌وه و ته‌وبه ئه‌كه‌م ٠

١٨ ـ كردنی دووڕكات نوێژ له‌دوای ده‌ســت نوێژه‌وه بـه‌ناوی سوننه‌تی ده‌ست نوێژه‌وه « **سُنّةُ الوُضوء** » له فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ره‌وه ـ صلى الله عليه وسلم ـ هاتووه كـه ئه‌بی هوره‌یره بۆمانی ئه‌گێڕێته‌وه

---

٣٦ ـ رواه مسلم ٠

**« انَّ رسول الله ــ صلى الله عليه وسلم ــ قالَ لِبِلالْ : يابلال حدّثني بارْجى عَمَلٍ عَمِلْتَه في الاسلام ، فاني سمعت دق نعلَيكَ بينَ يدَيّ في الجنّة . قال : ما عَمِلْتُ عَمَلاً ارجىَ عندي مِنْ انّي لَمْ اطّهّر طهُوراً في ساعَةٍ مِنْ ليْلٍ او نهار إلاّ صلّيتُ بذلكَ الطهور ماكتب لي ان أصلّي ــ مُتّفِق عَليه ــ وهذا لفظ البخاري »**

واته : پێغەمبەر ــ صلى الله عليه وسلم ــ فەرمووی بە بیلال ــ ڕەزای خوای لێ بێ ــ ئەی بیلال بۆم باس بکە چ کردەوەیەکی بەنرخو بەسوود ئەکەیت لەگەڵ ئەرازووی ئیسلام کێشانەی بکرێت، من دەنگی نەعلەکانت لەبەردەستما ئەبیستم لەبەهەشتدا حەزرەتی بیلال فەرمووی من هیچ کردەوەیەکم نەکردوە جێگای ئومێدبێ لەلام ئەوە نەبێ هیچ کاتێك نەبووە بۆم ڕەخسابێ کەدەست نوێژ بگرم چ بەڕۆژو چ بە شەو دووڕکات سوننەتی دەستنوێژم کردوە لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانی خوام لەسەرنەبووە بۆ بەجێ هێنانی واتە فەرز نەبووە لەسەرم بێجگە لەوەی کە ڕەوشتی تۆم جێ بەجێ کردوە ٠

## چەند وێنەیەك بۆ سوننەتەکانی دەستنوێژ



( ١ )

وێنەی شتنی دەستەکان



( ٢ )

وێنەی ئاو لە دەم ڕادان



( ٣ )

وێنەی ئاوڵە لووت ڕادان



( ٤ )

وێنەی دەست خستنە ناوپەنجەکانی قاچ

● ئەو شتانەی کەدەست نوێژیان پێ بەتاڵ ئەبێتەوە

١ ـ هەرچی لەپاش‌و پێشی ئادەمیزاد بێتە دەرەوە ، بەلگەشمان ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە کە ئەفەرمووێ « **أو جاءَ أحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الغائِطِ** » واتاکەی لەپێشەوە زانیمان . وە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێ : « **إذا وَجَدَ أحَدُكُم في بَطْنِهِ شَيْئاً فشكَّ عليه أخَرَجَ منه شيء أمْ لا ، فَلا يَخرجَنَّ مِنَ المسْجِد حتى يسمع صوتا او يجد ريحاً** »(٣٧) واتە هەرکاتێك یەکێکتان هەستی کرد بەشتێك لە گەدەیدا «سکیدا»بۆی بوو بەگومان ئایا شتێك دەرچوو یان نا ! بالەمزگەوت نەچێتە دەرەوە . واتە وانەزانێ کەدەست نوێژی شکاوە هەتاکو دەنگی نەبیستێ یان هەست بەبۆنی بکات . ئەم فەرموودە پیرۆزە ئەوەمان تێ ئەگەیێنێ کە هەرکاتێك لە گوماندا بووین بۆ شکانەنی دەست نوێژ بەهەوا هەتا بۆمان ڕوون نەبێتەوە نابێ بکەوینە گومانەوە .

٢ ـ نووستن : بەڵام ئەگەر کەسێك زێری خۆی قاییم بکات وە قورسایی خۆی نەخاتە سەر هیچ شتێك ئەگەر خەوی لێ کەورت ئەوە دەست نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە .

٣ ـ بەیەك گەیشتنی پێستی نێرو مێی بێگانە مەگەر منالێکی وا کە لە تەمەنێکی وادابێ هەست بە ئارەزووی دەروونی «نفسی» نەکات ئەوە دەست نوێژی پێ ناشکی .

٤ ـ نەمانی بیرو هۆش بەهەر هۆیەکەوە بێت .

٥ ـ دەست پێوەدانی ئادەمیزاد بەپاش‌و پێشی خۆیەوە یاپاش‌و پێشی یەکێکی ترەوە با منالیش بێت بەناو لەپی دەستی .

---

٣٧ ـ رواه الخمسة .

● ئەرکان وپایەکانی نوێژ :

١ ـ نیازو نیەت بەدڵ : ئەگەر نوێژی فەرزبوو پێویستە نیەت ومەبەستی کردنی نوێژەکەی لەدڵدابێت وە دیاریشی بکات نوێژی نیوەڕۆ یاعەسرە بۆنمونە نیەت هێنانی نوێژی نیوەڕۆ بەم جۆرەیە «نیەتمە فەرزی چوارڕکات نوێژی ئەم نیوەڕۆ ئەکەم بۆ خوا»وە بەڵگەمان بۆ هێنانی نیەت ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیه وسلم ـ «**إنّما الاعمالُ بالنيّات وإنّما لكل امرىء مانوى**» ٠

٢ ـ وتنی «**الله أكبر**» لە دوای نیەت هێنانەوە کەپێی ئەڵێن «**الله اكبر**»ی نوێژ دابەستن «**تحرّم**» ٠

٣ ـ ڕاوەستان لەکاتی خوێندنی سورەتی فاتیحەدا لەنوێژدا بەمەرجێ ئەو کەسە بتوانێ ، مەرجی ڕاوەستان بریتی یەلەوەی کەبڕگەکانی پشت بکەونە سەر یەك ئەگەر بەچەماوەیی یان بەخواری ڕاوەستا دروست نی یە مەگەر کەسێك نەشیوا ڕاهاتبێ لەبەرپیری یا لەبەر نەخۆشی ئەوە ئەتوانێ نوێژەکەی بەدانیشتنە وەبکات ٠

٤ ـ خوێندنی سورەتی فاتیحە لەهەموو ڕکاتێکدا چونکە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی « **لاَ صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرأ بِفاتحَةِ الكتاب** » واتە نوێژ نی یە بۆکەسێك کە سورەتی فاتیحەی تیا نەخوێنێ مەگەر بۆ کەسێك کە نەتوانێ بیخوێنێ یانهەندێ جار ٠ ئەگەر لەکاتی ڕکوعدا فریای نوێژی «جەماعەت = کۆمەڵ» بکەویت ئەوا ئەتوانی نیەت بهێنیو یەکسەر بچیتە ڕکوعەوە بە مەرجێ ئەوان هێشتا هەڵ نەسابنەوە لەڕکوع ئەمەش سورەتی فاتیحەیە :

**« بِسمِ الله الرَّحْمنِ الرَّحيمِ »**

**اَلْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ العالَمِينَ (١) الرَّحْمنِ الرَّحيمِ (٢) مالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٣) إيّاكَ نَعْبُدُ وَإيّاكَ نَسْتَعِينُ (٤) إهْدِنا الصِّراطَ**

المُستَقِيمَ (٥) صِراطَ الَّذينَ انعَمتَ عَليهِم (٦) غَيرِ المَغضُوبِ عَليهِم وَلا الضَّالِّينَ (٧) ٠

سورەتی فاتیحە لە «٧» ئایەت پێك هاتووە «٢٥» ووشەیە «١٢٢» پیتە ، ئەم سورەتە لەمەککە هاتۆتە خوارەوە ، وە ناوبراوە بەسورەتی فاتیحە بەواتای سەرەتاو کردنەوەی قورئان وە ووشەی «فاتحە» لە فەرمانی ڕابووردووی ـ فعل ماض ـ فَتَحَ ـ وەهاتووە بەواتای ـ کردیەوە ـ ئەم سورەتەش سەرەتای قورئانی پیرۆزە وەئەمەش واتای سورەتەکەیە :

« بسم الله الرحمن الرحيم »بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبانەوە٠

« الحَمدُ لِلهِ رَبِّ العالَمين »سوپاس‌و ستاییشی بێ‌پایان بۆ پەروەردگاری جیهان ٠

« الرَّحمنِ الرَّحيمِ »ئەو خوایەی کە بەخشندەو میهرەبانە ٠

« مالِكِ يَومِ الدِّينِ »خاوەنی ڕۆژی تۆڵەو سزایە ـ کەڕۆژی دوایی یە ٠

« إيّاكَ نَعبُدُ »خوایە هەر تۆ ئەپەرستین‌و بەندایەتی هەر بۆ تۆ ئەکەین ٠

« وَإيّاكَ نَستَعينُ »وەداوای یارمەتی‌و دەست گرتن هەر لەتۆ ئەکەین ٠

« إهدِنا الصِّراطَ المُستَقيم »خوایە ڕێنمونیمان بکەو بمان خەرە سەر ڕێگەی ڕاست لەهەردوو جیهاندا ٠

« صِراطَ الَّذينَ انعَمتَ عَلَيهِم »ڕێگەی ئەو کەسانەی کە بەمیهرەبانی خۆت هۆی ئاساییشی نەبڕاوەت پێ بەخشیوون وەچاکەت لەگەڵدا کردون کەبریتین لە پێغەمبەران‌و پیاو چاکان‌و شەهیدان ٠

« غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِم »ڕێگای ئەوانەمان پێ مەبەخشە کەڕقت لێ هەڵگرتوون‌و لێیان تووڕە بوویت لە بەر بیرو باوەڕی

ناڵەبارو گردەوەی ناپەسەندیان ·

« ولا الضالين »وەڕێگەی ئەو کەسانەش نا کەڕێگەی ڕاستیان وون کردووەو گومڕابوونو سەریان لێ شێواوە ·

« آمين »ووشەی ـ آمين ـ سوننەتە بەواتای خوایە ئەم پاڕانەوەیەمان بەمیهرەبانی خۆت لێ وەربگرە ·

٥ ـ ڕکوع واتە «چەمینەوە» بە جۆرێك بەری دەستەکان بگاتە سەر ئەژنۆ ·وە لەکاتی چەمینەوەدا «الله اکبر» بووترێت وەئەوەندە بمێنێتەوە لەڕکوعدا هەتا لەشی لەجم وجوول بکەوێت وەسێ جار بڵێ « سُبْحَانَ رَبِّيَ العَظِيمِ وبِحَمْدِهِ » وەبۆ کەسێك کە ئارەزووی هەبێت ئەتوانێ ئەم پاڕانەوەیەش بڵێت چونکە لەپێغەمبەرەوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ وەرگیراوە « اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي » ـ رواه مسلم ـ واتە : ئەی خوایە هەر بۆتۆ ئەچەمێمەوە ، وە هەر بەتۆ باوەڕم هەیە ، وە هەر بۆ تۆ مل کەچم ، وە گوێمو چاوم و مۆخمو ئێسکمو ڕەگەو دەماری لەشم لەتۆ ئەترسێ ·

٦ ـ ڕاست بوونەوە لە ڕکوع : دوای ڕاست بوونەوە لەڕکوع ئەوەندە وەستان پێویستە هەتا لەش لەجمو جوڵ بکەوێت ، وەلەکاتی ڕاست بوونەوەدا بووترێت « سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ـ رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ ـ مِلْءَ السَّمٰوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ ومِلْءَ مَاشِئْتَ مِنْ شَيءٍ بَعْدُ » واتە : خوا دەنگی ئەوکەسانە ئەبیستێ کەسوپاس وستاییشی ئەکەن ـ ئەی پەروەردگاری ئێمە سوپاسو ستاییش هەر شایستەی تۆیە ـ وەهەر بۆ تۆی ئەکەین ستاییشێك کە بەئەندازەی پڕبوونی ئاسمانەکانو زەوی‌وە بەئەندازەی پڕی ئەو شتەی کەخۆت ئارەزووت لێ بێتی ·

٧ ــ کڕنووش «السجدة» بریتی یه لەدانەواندنو سەرخستنە سەر سوجدەگا وە ووتنی «الله اکبر» لەکاتی چەمانەوەدا بۆکڕنووش وە پێویستە لەپێشەوە ئەژنۆکان بخرێنە سەرزەوی ، ئینجا هەردوو دەست لەگەڵ ئاو چاواندا وەئەوەندە مانەوە پێویستە لەسوجدەدا هەتا لەش لە جووڵە بکەوێت وسێ جار بوو ترێ « سُبْحانَ رَبِّي الأعلى » وەلەگەڵ سوجدەدا سوننەتە ئەم نزاو پاڕانەوەیە بخوێنرێت واتە لەوکاتە کە هەرسەری لەسەر زەوی یە کە.یە « اللهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ اسْلَمْتُ سَجَدَ وجْهِي للذي خَلَقَهُ فصَوَّرَه فاحسَنَ صُوَرَه وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ فَتَبارَكَ الله احسَنُ الخالقين » ــ رواه احمد ومسلم ــ واتە : خوایە هەر بۆتۆ کڕنووشی بەندایەتی ئەبەم وە هەرباوەڕم بە تۆیە وە هەر بۆ تۆ گەردن کەچم ، کڕنووشی برد دەمو چاوم بۆئەو کەسەی کە دروستی کردوە وە وێنەی کێشاوە وە چاوو گوێی لێ کردۆتەوە ، پیرۆزی وپاکو بێگەردی بۆتۆیە خوایە بەڕاستی باشترین وچاکترین خواو دروست کەری ٠

٨ ــ دانیشتن لەنێوان هەردوو سوجدەکەدا ٠ وەئەوەندە بمێنێتەوە هەتا لەش لەجمو جوڵ بکەوێت وە سوننەتە بووترێت « رَبِّ إغفِرْ لي وارحمني وَاجبرني وارفعني وَاهدني وَعافِني » واتە : ئەی پەروەردگارم لێم خۆش بەو بەبەزەیی بە لەگەڵم وە چاوپۆشی لەهەڵەکانم بکە وە پلەو پایەم بەرزبکەرەوە ،وە ڕێنموونیم بکە ٠

٩ ــ خوێندنی تەحیات ٠

١٠ ــ دانیشتن بۆ خوێندنی تەحیات ٠

١١ ــ سلاوات دان لەسەر پێغەمبەر ــ صلى الله عليه وسلم ــ وە تەحیاتیش بەم جۆرەیە « التَّحِيات لله والصَّلوات والطَّيِّبات السَّلام عَلَيكَ ايها النَّبيُّ وَرَحمَةُ الله وَبَرَكاتُه ، السَّلام عَلَيْنا وَعلى

عِبادِ اللهِ الصّالِحينَ أشهَدُ أنْ لا إِلهَ إِلا اللهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ وأشهَدُ أنَّ مُحمّداً عَبدَهُ وَرَسولُهُ ـ اللّهُمَّ صَلِّ عَلى مُحَمّدٍ وَعلى آلِ مُحَمّدٍ كما صَلَّيتَ على إبراهيمَ وَعلى آلِ إبراهيم وَبارِك عَلى مُحَمّدٍ وعلى آل محمد كما بارَكْتَ على إبراهيمَ وعلى آل إبراهيمَ في العالَمين إنّكَ حَميدٌ مَجيدٌ » .

**واتای تەحیات :**

« **التّحيّاتُ لِله والصّلواتُ والطّيّباتُ** » بەرزیو بلندیو خەیرو بەرەکەت وکرنووش بردنو سوپاسی بێ پایانو کردەوەی چاك هەر شیاوی تۆیە ئەی خوای مەزن « **السّلامُ عَلَيكَ أيُّها النّبيُّ** » : درووددو سلاّوو ئاشتیو هێمنی خوات لێبێ ئەی ڕابەری خوا « **وَرَحمَةُ الله وبركاته** » : لەگەڵ ڕەحمەتی بێ پایانی خواو خەیرو بەرەکەتی فراوان ئەی سەروەری جیهان .

« **السّلامُ عَلَينا وَعَلى عِبادِ اللهِ الصّالحين** » : ئەو ئاشتیو ئاسایشەی خوا لەسەر ئێمەی بەندە بێو ، وەلەسەر هەموو بەندەیەکی خەیر خوازی خوابێ بەتایبەتی ئەوانەی کە کردەوەی چاکە ئەکەنو پەیرەوی فەرمانی خوا ئەکەن .

« **أشهدُ أنْ لا إلهَ إلاّ اللهَ وحدَهُ لا شريكَ له** » : بەدڵ بڕیارو شایەتی ئەدەم وەبە زمان ئاشکرای ئەکەم کەهیچ پەروەردگارێك نییە کەشیاوی پەرستن بێت بێجگە لەو خوایەی کەتاکو تەنیایەو ئافەریدەی ئەم جیهانەیە .

« **وأشهَدُ أنَّ محمّداً عبده ورسوله** » : وە هەمان بڕیارو شایەتی ئەدەم بەدڵو بەزمان کە ـ محمد ـ صلى الله عليه وسلم ـ بەندەی خوایەو ڕەوانە کراوی ئەوە .

« **اللّهُمَّ صَلِّ عَلى محمد وَعَلى آلِ محمد** » : خوایە ڕەحمەتی فراوانی خۆت بڕێژە بەسەر پێغەمبەرو خاوو خێزانیا .

« **كَما صَلّيتَ عَلى إبراهيمَ وَعَلى آل ابراهيم** » : هەر وەكو چۆن ڕەحمەتی بۆ پایانت ڕژاند بـەسەر حـەزرەتی ئیبراهیمو خاوو خێزانو شوێن کەوتوانی ٠

« **وَبارِك عَلى محمـد وَعَلى آلِ محمد** » : خوایـە خـەیرو بیتو بەرەکەت بنێرە بۆسـەر گیانی پاکی خۆشەویستی خۆت ــ محمد ــ وە خاوو خێزانی وشوێن کەوتووانی ٠

« **كَما بارَكْتَ عَلى ابراهيم وَعَلى آلِ ابراهيم** » : هەر وەکو چۆن ئەو خەیرو بەرەکەتەت ڕژاندە سەر حەزرەتی ئیبراهیمو خـاوو خێزانیو شوێن کەوتووانی لە هەموو کاتێکدا ٠

« **في العالمين إنَّكَ حَميدٌ مَجيد** » : تۆ ئەی پەروەردگار خـاوەنی سوپاسو بەزەییو بڵندیت ٠

١٢ ــ سەلام دانەوە بەلای ڕاستدا ، وە نوێژکەر پێویستە ئەوەندە لابکاتەوە کوڵمی ڕاستی ببینرێتو بڵێت « **السَّلام عَليكُمْ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكاتُه** » واتـە : هێمنیو ئاشتیو ئاسـایشو ڕەحمـەتی بۆ پایـانی پەروەردگار لە سەر ئێوە بێ ئەی برایانی مووسڵمانی لای ڕاسم ، چونکە مەبەست لەسەلام دانەوەی لای ڕاست مـەبـەست ئـەو موسڵمانانەن کەوتوونەتە لای ڕاستەوە ٠

١٣ ــ دوا بەدوای یەك «الترتيب» واتە بەجێ هێنانی ئەرکانەکانی نوێژ بەڕێکو پێکیو یەك لەدوای یـەك بەو جۆرەی کـەباس کرا پاشو پێش نەخرێن :

**«عَنْ أبي هريرة رضي الله عنه ـ انه قال: دَخَلَ رَجُلٌ المَسجِدَ وَصَلّى ثُمَّ جـاءَ الى النبي ـ عليـه السَّلام ـ فسَلَّمَ عليه فَرَدَّ عليـه النبي وقـال : إرْجَعْ فَصَلِّ فانَّكَ لـم تصـل فرَجَع فَفَعَلَ ذلِكَ ثلاثَ مَرّات وقال : والّذي بَعَثَكَ بالحَقِّ ما احْسَنَ غيره فعَلِّمني ثمَّ قالَ النبي : إذا قُمْتَ إلى الصَّلاةِ فكَبِّرْ ثُمَّ إقرأ مـاتيسَّرَ مَعَكَ مِـنَ القرآنِ ثمَّ إركَعْ حَتّى تَطمَئِنَّ راكعـاً ثُمَّ إرْفَعْ حَتّـى تعتَدِلَ**

قائماً ثمّ اسجد حتى تطمئنّ ساجداً ثمّ إرفعْ حتى تطمئن جالساً ثمّ اسجد حتى تطمئن ساجداً ثمّ افعلْ ذلكَ في الصلاة كلها » ـ مُتفق عليـه ٠

واته : ئەبی هورەیرە ـ فەرموویەتی : پیاوێك ڕۆیشتە مزگەوتەوە نوێژی کرد لەدوای لێبوونەوە لەنوێژەکەی ڕۆیشتە خزمـەتی پێغەمبەرو سەلامی لێکرد پێغەمبـەر ـ صلی الله علیـه وسلم ـ وەلامی سەلامەکەی دایەوە پێی فەرموو برۆ نوێژەکەت بکە چونکە تۆ نوێژت نەکرد هەتاسێ جار پیاوەکە نوێژەکەی هەر کردەوە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ هـەر فەرمووی برۆ نوێژەکـەت بکـە ئینجـا کابرا ووتـی سوێند بێ بەوکەسەی تۆی ڕەوانە کردوە بەڕاستی لەوە باشتر نازانم نوێژ بکەم ، فێرم بکە ، پێغەمبەر فەرمووی هەرکاتێك هەستای بۆ نوێژ «الله اکبر»ی کردنەوەی نوێژ بکە،واتە «الله اکبر»ی دوای‌نیەت، دوای ئەوە بخوێنە لەو قورئانەی کەپێتە واتە سورەتی فاتیحە ، یەکێك کـە نەتوانێت سورەتی فاتیحە بخوێنێت بۆی هەیە هـەندێکی تر لەقورئانی پیرۆز بخوێنێ کـە ئەوەندەی سورەتی فاتیحە بێت ، لەنوێژەکەیدا دروستە بۆ یە پێغەمبەر پێی فەرموو ئەوەی کەپێتە لـە قورئان ، لـە دوای خوێندنی قورئانـەکە ڕکوع بەرەوە ئەوەندە تیایا بمێنەوە هەتا لەشت لەجمو جوڵ بکەوێتەوە دڵنیابی لەوەی کەچوویتە ڕکوعەوە لە دوای ڕکوع ڕاست بەرەوە بەجۆرێك کەڕێك بووەستی ، ئینجا سوجدە بەرە هەروەهـا تیایا بمێنەرەوە هـەتا لەش لە جمو جوڵ بکەوێت ئینجا لە سوجدە هەلسەرەوە و دانیشە هەر بەوجۆرە ئینجا سوجدە بەرەوەو ئـەوەندە تیـایا بمێنەرەوە کـە دڵنیای لەوەی کەچوویتە سوجدەوە ئینجا هەر بەووجۆرە نوێژەکەت هـەمووی بە جێ بهێنە ٠

پێغەمبەری خوا بۆیە ئەو پیاوەی سێجار گەڕاندەوە بۆ نوێژکردن چونکە نوێژەکەی بەڕێك وپێکی نەکرد،لەرکوعو سوجدەکاندا نەئەوەستاو پەلەی کرد کە واتە پێویستە لەسەرمان هەموو ڕوکنەکانی نوێژ بەهێواشی ولەسەرخۆیی بەجێ بهێنین وە بزانین وتێبگەین کەچی ئەڵێین وچی ئەکەین وە لەکوێدا وەستاوینو لەگەڵ کێ گفتوگۆ ئەکەینو لەکێ ئەپاڕێینەوە بەتایبەتی لە کاتی خوێندنی سورەتی فاتیحەدا کەڕاستەو خۆ گفتوگۆیەکو پاڕانەوەیەکە لەنێوان بەندەو پەروەر دگاریدا ..

## چەند وێنەیەك بۆفەرزەكانی نوێژ



( ١ )

چونیەتی نیەن هێنان



( ٢ )

**چۆنیەتی** وەستان بۆخوێندنی سورەتی ئاتیحە



( ٣ )

چۆنیەتی رکوع بردن



( ٤ )

چۆنیەتی هەلسانەوە لەرکوع



( ٥ )

چۆنیەتی کڕنووش بردن



( ٦ ) دانیشتنی نێوان سوجدەکان



( ٧ ) چۆنیەتی خوێندنی «تەحیات»



( ٨ ) چۆنیەتی «سەلام» دانەوە

# سوننەتەکانی نوێژ

سوننەت : بریتی‌یە لەو ڕەوشتەو کردارەی کە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ کردبێتی یـا بڕیاری لەسەر دابێت بۆ کردنی یا بێدەنگ بووبێ لێی کاتێك یەکێك کردبێتی لە خزمەتیا ٠ ئەمانەی خوارەوەش لە سوننەتەکانی نوێژن ٠٠

١ ـ دەست بەرز بکرێتەوەو ڕوو لە ڕووگە بێ‌و هـەردوو پەنجـە گەورە لە ئاستی نەرمایی گوێدا ڕابگیرێت ٠

٢ ـ دانانی دەست لەسەرووی ناوکەوە لەکاتی خوێندنی سورەتی فاتیحەدا ٠ وە بەدەستی ڕاست مەچـەکی دەستی چـەپ بگرێت وەکو لەوێنەی فەرزەکانی نوێژدا پیشان دراوە ٠

٣ ـ خوێندنی دوعای نوێژ واتە دوعای «استفتاح» دۆعای کردنەوە ٠ لە پێغەمبەری پێشەواوە چەند دوعایەك وەرگیراوە کە یەکێکیان ئەمەیە:

**« وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمٰوَاتِ وَالارضَ حَنِيفاً مُسْلِماً وَمَا أنَا مِـنَ المُشرِكِينَ إنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلهِ رَبِّ العَالَمِينَ لا شَرِيـكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأنـا مِـنَ المُسْلِمِينَ »**

واتـە : بـەڕاستی‌و بێ‌گومان ڕووی خۆم هـەڵسوڕان بۆ بـەندەیی ئـەو پەروەردگارەی کە ئاسمانەکانی دروست کردوە،وە بەدیهێنەری زەوی‌یە وە هەرپاساو ڕێبازی خوایـە کـەشیاوی خۆ تەسلیم کردنـە وە مـن لەو کەسانە نیم هاوەڵ «شریك» بۆ پەروەردگاری ئەم جیهانە بڕیاربدەم، بەڕاستی نوێژ کردنی من‌و بەجێ هێنانی فەرمانەکانی تری خواو ژیان و مردنم هەمووی بۆ پەروەردگاری جیهانە وە پاداشتیشم هەر لای ئـەوە وهیچ هاوەڵێکی نی‌یەو ، من فەرمانم بەمە پێدراوە کە موسڵمان‌بم ٠

٤ ـ له دوای دوعای کردنه‌وه‌ی نوێژ سوننه‌ته « **أعوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم** » بوترێت واته : په‌نا ئه‌گرم بـه خوا لـه‌و شه‌یتانه‌ی که بێبه‌ش کراوه له‌ره‌حمه‌تو به‌زه‌یی خوا ٠

٥ ـ ووتنی ووشه‌ی ـ آمین ـ له دوای خوێندنی سوره‌تی فاتیحه ٠

٦ ـ خوێندنی سوره‌تێکی قورئـان یا چـه‌ند ئایـه‌تێك لـه دوای خوێندنی سوره‌تی فاتیحه بۆ که‌سێك که نوێژه‌که‌ی به کۆمه‌ڵ «جه‌ماعه‌ت» نه‌کات ئه‌گه‌ر نوێژه‌که‌ی به‌کۆمه‌ڵ کرد پێش نوێژ ده‌نگی به‌رزکردەوه بۆ خوێندنی سوره‌تی فاتیحه‌و سوره‌تی تر ، وه له‌نوێژی «به‌یانی‌و ئێواره‌و خه‌وتناندا ئه‌بێ پاش نوێژ «مأموم» واته ئه‌وانه‌ی له‌دوای پێش نوێژه‌وه «إمام» وه ستاون ته‌نها ئه‌بێ سوره‌تی فاتیحه بخوێنین ، به‌ڵام پێش نوێژ له‌نوێژی «نیوه‌ڕۆو عـه‌سردا» ده‌نگ به‌رزناکاته‌وه پێش نوێژ ئه‌توانێ‌و سوننه‌تیشه له دووڕکاتی یه‌که‌مدا سوره‌تێك یان چه‌ند ئایه‌تێك بخوێنێ له‌دوای سوره‌ی فاتیحه ٠

٧ ـ کردنی «الله اکبر» له‌کاتی هه‌ڵسان‌و دانیشتنی نوێژه‌که‌دا ٠

٨ ـ ده‌نگ به‌رزکردنـه‌وه بۆپێش نوێژ لـه‌کاتی نوێژی بـه‌یانی‌و ئێواره‌و خه‌وتناندا ٠

٩ ـ خوێندنی ئه‌وزکرو پاڕانه‌وانه کـه له‌ڕکوع‌و سوجده‌کاندایـه وه‌کو باس‌کرا له‌به‌شی فه‌رزه‌کانی نوێژدا ٠

١٠ ـ خوێندنی ئه‌م نزایه له‌کاتی دانیشتنی نێوان سوجده‌کاندا ٠

« **اللهم اغفرلي وَارْحَمْني واهدِني وَعافني وارزُقني** »

١١ ـ خوێندنی ته‌حیاتی یه‌که‌م که‌ه‌ه‌تا «**اللهم صَلِّ على محمد**» ٠

١٢ ـ دانیشتن بۆته‌حیاتی یه‌که‌م به‌م شێوه‌یه «قاچی چه‌پ ئه‌خرێته ژێر ڕانی چه‌په‌وه وه‌قاچی ڕاست ڕوو به‌ڕووگه هه‌ڵ ئه‌درێت وه له‌سه‌ر په‌نجه دائه‌نرێت ٠

١٣ ـ شێوەی دانانی پەنجەکانی دەست بەم شێوەیە دەبێت : پەنجەکانی دەستی چەپ بەکراوەیی لەسەر ئەژنۆ دائەنرێن وە پەنجەکانی دەستی ڕاست دائەخرێن بێجگە لە پەنجەی «شەهادەت» کە نوێژکەر لەکاتی خوێندنی تەحیاتدا کە گەییشتە ووشەی «إلاّ الله» لە هەردوو تەحیاتەکەدا هێما «ئیشارەت»ی تەنهایی خوای پێ ئەکرێت وە هەروەها پەنجە گەورەش دائاخرێت .

١٤ ـ سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر لە تەحیاتدا .

١٥ ـ شێوەی دانیشتنی تەحیاتی دووەم لەبن قاچی چەپ بۆلای ڕاست لە ژێر قاچی ڕاستەوە دەرئەکرێت وقاچی ڕاست پەرمو ڕووکە هەڵ ئەدرێت لەسەر پەنجەکان وەلای چەپ ئەخرێتە سەرزەوی بۆکەسێك کە بتوانێ .

١٦ ـ خوێندنی «قنوت» لە نوێژی بەیانیدا کە لەکاتی هەڵسانەوە لەڕکوعدا لە ڕکاتی دووەمی نوێژەکەدا دەخوێنرێت وە لەکاتی خوێندنیدا هەردوو دەست بەرز ئەکرێنەوە، ئەمەش قنوتە « **اللّهُمَّ اهدني فيمَنْ هَدَيتَ وعافني فيمَنْ عافَيت وتَوَلَّني فيمَنْ تَوَلَّيتَ وبارِكْ لي فيما أعطَيت وقِني شَرَّ ما قَضَيتَ فانَّكَ تَقضي ولا يقضى عَليكَ إنَّهُ لا يَذِلُّ مَنْ والَيتَ ولا يَعِزُّ مَنْ عادَيت تَبارَكتَ رَبَّنا وتَعالَيتَ . فَلَكَ الحَمدُ على ما قَضَيتَ استَغفِرُكَ وأتوبُ إليكَ وَصَلّى الله على سيّدنا مُحَمَّدٍ وعلى آلِهِ وصَحبِهِ وسَلَّم** » دوای خوێندنی ئەم دوعایە هەردوو دەستەکان هەر بە بەرز کراوەیی بەئاستەم ئەخرێنەوە سەرزەوی وە سوجدە دەبرێت . ئەمەش واتای «قنوت»ە :

ـ ئەی خوایە ڕێنماییمان بکە وەك ئەو کەسانەی کەڕێنماییت کردوون ، وە لێمان ببوورە وەك ئەو کەسانەی کەلێیان بوردوویت ، وە سەر پەرشتیمان بکە وەك ئەو کەسانەی کە سەرپەرشتیت کردون وە

پیرۆزی بکە لێمـان ئـەو شتەی کـەپێت بە خشیووین وەبمان پارێزەو بەئارامان بکە تا بەرگەی ئەو بەڵایانە بگرین کە تۆ بەسەرماندا دەیان هێنیت ، وە بەڕاستی هـەر تۆ دادو فـەرمان ئەکـەیت بەسەر هـەموو شتێکدا ، وە باڵا دەستت کـەس نی‌یە کـە فـەرمانت بـەسەردا بکـات وەبەڕاستی ئەوکەسەی کـەتۆ سەرپەرشتی ئەکـەیت هـەرگیز ڕیسوا نابێت وەئەوکەسەی کەدژی تۆبێت هەرگیز بەرێز نابێت، پاکو بێ‌گەردی بۆ تۆیە ئەی پەروەردگاری ئێمە وەتۆ بەرزو بڵندیت ، ستاییش هەر بۆ تۆیە لەسەر ئەوشتەی کەبۆت دیاری کردوین ، وەداوای لێ خۆش بوونەو گەڕانەوە لە گوناهوو تاوان هەر لـە تۆ ئەکەین ٠ بڕێژە ڕەحمەتی بێ پایانی خۆت بەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری خۆشەویستمان وخاووخێزانی‌و یارو هاوەڵانی ٠

١٧ ـ خوێندنی پاڕانەوەی دوای تەحیاتی دووەم، سونتەتە لەدوای تەحیات دۆعاو پاڕانەوە بخوێنرێت، بەڵام باشتر وایە ئەم دوعاو پاڕانەوانە بـوترێ : « اللّهُمَّ اغفِرْ لي ما قدَّمتُ وما اخَّرْتُ وما اسْرَرْتُ وَما اعْلَنْتُ وَما اسْرَفْتُ وَما انتَ اعلَمُ بِهِ مِنّي انتَ المُقَدِّمُ وَانتَ المُؤَخِّرُ لا إلهَ إلاّ انتَ » ـ رواه احمد ومسلم ـ واتە: خوایە لێم ببوورە لـەو کردەوانەی کـە کردوومە لـەژیانمدا چ ئەوانەیان کـە پێش‌مەرگی خۆمم خستووە چ ئـەوانەیان لەدوای مەرگم شوێنـەواریان ئەمێنێت وە هەروەها لەو کردەوانەش کەبە پەنامەکی کردومە یا بەئاشکرا وەلەو کردەوانەم کـەزیادە ڕەویم تێدا کردون وە ئەوانەش کـەتۆزانای پێیان ٠ ئەی خوایە هەر خود «ذات»ی تۆیە سـەرەتای بوونی نـەبووەو هەرهەیە ، وەکۆتاییشی بۆنی‌یـەو هەرئەمێنێت ٠ هیچ پـەروەردگارێك نی‌یە شیاوی ئەوەبێ کە بەندایەتی بۆبکرێ بێجگە لەتۆ ٠٠ یەکێکی تر لەو دوعایانە ئەمەیە : « اللّهُمَّ إني اعوذُ بِكَ مِنْ عذابِ القبرِ وَمِنْ عذابِ النّارِ وَمن فِتنةِ المَحيا والمماتِ » ٠ ـ واتە ـ ئەی خوایـە مـن

پەناتەگرم بەتۆ لەسزاو ئازاری قەبر وە لـەسزای ئاگری دۆزەخ وەلـە ئازاو ئەشکەنجەی مردنو ژیانم • هەروەها ئـەم دوعایـەش سوننەتـە بخـــوێنـرێـــت : « **اللّهمَّ رَبّنا آتِنـا في الدُّنيـا حَسَنَةً وفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ** » ـ رواه البخاري ـ •

واتە : خوایە ئەی پەروەردگاری ئێمـە پێمان ببەخشەو بماندەرێ لە جیهاندا چاکە وە بماندەرێ لـەژیانی پاشەڕۆژدا خـەیرو چاکـە وە لەئازاری ئاگری دۆزەخ بمان پارێزە •

١٨ ـ سەلام دانەوەی لای چـەپ بەشێوەی سـەلام دانەوەی لای ڕاست هەروەکو لەفەرزەکانی نوێژدا باس کرا •

١٩ ـ بەرزکردنەوەی هەردوو دەست هـەتا ئاستی گوێ لـەکاتی هەستانەوە لەڕکوعدا •

# نزاو پاڕانەوەکانی دوای نوێژ

سوننەتە بۆ موسلمان کە لەنوێژەکەی بوەوە بەکۆمەڵ «جەماعەت»بێ یاخۆی بەتەنها ئەم نزاو پاڕانەوانە بخوێنێت کە لە پێغەمبەرەوە وەرگیراون • لەدوای سەلام دانەوە سێجار بڵێ «أستغفر الله» وەیەك جار: **«اللهم انتَ السَّلام وَمِنكَ السَّلام تبارَكتَ ياذْ الجلالِ والاكرام»** ئەگەر نوێژی بەیانی یان ئێوارەبوو دە جار بڵێ: **« لا إلهَ إلاّ اللهَ وحدَهُ لا شَريكَ لَه ، لَهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ يُحيي وَيُميت بِيَدِهِ الخَير وَهوَ على كلّ شيءٍ قَدير »** ئینجابڵێ: **« إليه المَرجعُ والمآلُ والمَصير نجّنا مِن عَذابِ النّار وَمِن عَذابِ اهلِ السّعير »** ئینجا حەوت جاربڵێ : **« اللّهمّ خَلّصنا من النّار »** وەحەوت جار : **« اللّهمّ اجرنا مِنَ النّار »** وەسێ جار : **« اللهم ادخِلنا الجنّة »** وبڵێت : **« اللهم ادخِلنا وادخِل والدينا الجنّة مَع المُتّقين الابرار بجاه النبيّ المختار ــ آمين بِرَحمَتِكَ يا أرحَمَ الرّاحمين »** وە لەدوای ئەم دوعایانە سوننەتە دەست بهێنرێت بەدەمو چاودا ئینجا « آية الكرسي » بخوێنرێت کەئەمەش ئایەتەکەیە :

**ــ اعوذُ باللهِ مِنَ الشّيطان الرّجيم ــ**

**« اللهُ لا إلهَ إلاّ هُوَ الحَيُّ القَيّوم لا تأخُذُهُ سِنَةٌ ولا نَومٌ لَهُ مافي السّموات ومافي الارض مَنْ ذا الّذي يَشفَعُ عِندَهُ إلاّ بِإذنِه يَعلَمُ مابَينَ أيديهِم وما خَلفَهُم ولا يُحيطُونَ بِشَيءٍ مِن عِلمِهِ إلاّ بما شاءَ وَسِعَ كُرسِيّهُ السّموات والارض ولا يَؤُدُهُ حِفظُهُما وَهُوَ العَلِيُّ العَظيم »** •

واتاکەی : ئەو خوایەی کە ناوی پیرۆزی ــ الله ــ یە هیچ کەسێك نییە شیاوی پەرستن بێت بێجگە لەو هەرئەوە ئەمێنێو ژیانی بەردەوامەو نەبوونی ڕووی تێ ناکات • بەدەسەڵاتو بەهێزە بۆ پەروەردەکردنی

دروست کراوانی خۆی‌و پارێزگاری کردنیان . بەهیچ جۆرێك نەخەوخەو نۆچکە «وەنەوز» ئەیگرێ‌و نە نووستنی تایبەتی،فەرامۆشی بەسەردا نایەت، هەر بۆ خوایە ئەوەی وا لەئاسماندا بە بینراوو نەبینراویەوە ، وە ئەوەی لەزەویدایە بەئاشکراو نهێنی‌یەوە ، ئەوەکێ‌یە بتوانێ تکابکات بەلای ئەوەوە «خواوە» بۆ تاوانبارێ یا خاوەن ئازارێ ؟ کەس نی‌یـە مەگەر پارمەتی «ڕوخسەتی» پەروەر دگاری لەسەربێ . خوای گـەورە ئەزانێ و زانایـە بەوشتانەی کەوان لەبەردەمی ئادەمیزادو جیننی‌داروە ئەوشتانەش کەوان لەپشتیانەوە . واتە ئەو شتانەی کە لەمەولا لەڕۆژی دواییدا ئاگادار ئەبێ بەسەریاندا ، ئادەمیزادو جیننی ئاگادار نابن بـە هـەندێك لەزانستو زانیاری خوا مەگەر ئەوەی کە خوای گەورە خواستی لـەسەربێ . داگیر ئـەکات فراوانی ئاسمانـەکان‌و زەوی ـ گوشادی کورسی خوا ، واتـە ئاسمانەکان‌و گۆی زەوی لەچاو فراوانی کورسی خواداوەك هـەڵماتێك‌وان لە چاو ژوورێکدا . بەم جۆرە خوای گەورە دەسەڵاتی پەنامـەکی هەیـە ئێمەی ئادەمیزاد تێ ناگەین لێی وە لـە پارێزگاری‌و چاودێری ئاسمان‌و زەویدا خوا بێزارو بێ‌تاقەت نابێ ، بەڕاستی هەرخوای گـەورەیە پایە بەرزی وا کەوێنەی نەبێت‌و لەبەرزی و دەسەڵاتا هاوکێشی نەبێت هەموو شتێك لەچاو گەورەیی خوا وەکو نەبوو وایە .

دەگێڕنەوە لەپێشەوای مووسڵمانان حـەزرەتی عـەلی‌یەوە «ڕەزای خوای لێ‌بێ » فـەرموویەتی بیستوومـە لەپێغەمبەرەوە ـ صلی الله علیـه وسلم ـ لە کاتێکدا ڕاوەستا بوو لـەلای ئـەو کوڵەکـەیـەی گـەوتاری «خطبە»ی لەسەر ئەدا لەجیاتی مینبەر لەمزگەوتی مەدینەدا فـەرمووی :

« مَنْ قرأ آيةَ الكُرسي دُبُرَ كُلُّ صلاةٍ لَمْ يَمْنعه منْ دخولِ الجنّةِ إلا الموتَ ولا يواظِبُ عليها إلا صدّيقٌ او عابِدٌ ، ومَنْ قرأها إذا أخذَ مَضجَعَه آمنَ اللهُ على نفسِهِ وجارِهِ وجارِ جارِهِ والابياتِ حَوْلَهُ»

واتە : هەرکەسێك بخوێنێ ـ ئایەتی کورسی ـ لـەدوای هـەموو نوێژە

فەرزەکانیەوە هیچ شتێ نی‌یە قەدەغەی لێ بکات بۆ چوونە ناو بەهەشت بێجگە لە مەرگ ، واتە هەچ کاتێ مرد خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا بەهەشتی پێ ئەبەخشێ ، کەسێك نی‌یە بەردەوام بێ لەخوێندنی ئایەتی کورسی بێجگە لەڕاست گۆو بەندەی ڕاستەقینەی خوا ، واتە مەگەر کەسێك هەلسێ بەم کارە گەورەیە وبەردەوام بێ لەسەری کەشەهادەی ڕاستیو بەندایەتی خوای گەورەی وەرگرتبێ • وە هەرکەسێك ئایەتی کورسی بخوێنێت کاتێك کە ئەچێتە جێگای نووستنەوە ـ پارێزراوئەبێ لە لایەن خواوە لەو شتەی کەزیان بەخشە بۆیو دراوسێ کەشی ودراوسێی دراوسێ کەشی پارێزراو ئەبێ وەئەوماڵانەش کەلەوگەڕەکەدان هەموویان پارێزراو ئەبن بەهۆی بەرەکەتی ئایەتی کورسی‌یەوە

هەروەها سوننەتە لەدوای خوێندنی ئایەتی کورسی ئەم نزاو یادکردنەوەیەی خوا بخوێنرێت : « **اللَّهُمَّ لا مانِعَ لِما أعْطَيْتَ ولا مُعطِيَ لِما مَنَعْتَ ولا رادَّ لِما قَضَيْتَ ولا يَنفَعُ ذا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ سبحانكَ** « **سُبحانَ الله** ـ٣٣ـ **جار** » ، **سبحانَكَ لا عِلمَ لَنا إلاّ ما عَلَّمتَنا إنَّكَ أنتَ العَليم الحكيم دائما باقياً شكراً** « **الحَمدُ لِله** ـ٣٣ـ **جار** » **الحَمدُ لِله الَّذي هَدانا لِهذا وما كُنّا لِنَهْتَدِيَ لولا أنْ هَدانا الله مِن كُل كَبيرٍ كَبيراً** « **الله اكبر** ـ٣٣ـ **جار** » **الله اكبر كبيرا والحمد لله حَمْدا كثيرا سبحانَ الله بُكرةً واصيلاً** ـ « **لا إلهَ إلاّ اللهَ وَحدَه لا شريكَ لَهُ ، لَهُ المُلكُ ولَه الحَمد يُحيي ويُميت بِيدِهِ الخَير وهُو على كُلِّ شيءٍ قَدير** ـ١ـ **یەك جار** » لەپاش ئەمە سلاوات بدرێت لەسەر پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەبەر ئەوەی هەرپاڕانەوەیەك سلاوات دانی لەگەلدابێت نزیکە لەخوای گەورەوەو وەری ئەگرێو جێبەجێی ئەکات ، پاش سلاوات دان هەردوو دەستەکانت بەرز بکەرەوە هەتا ئاستی شانت وەبپاڕێرەوە لەخوا وەباشتروایە بەو دوعایانە بپاڕێیتەوە کەپێغەمبەری خوا پێیان پاڕاوەتەوە ، وەیەکێ لە پاڕانەوەکانی

پێغەمبەر ئەمەبووە : « عنْ شدّاد بنْ اوس ـ رضي الله عنه ـ عن النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ قالَ سَيِّدُ الاستِغفار **اللّهمَّ أنتَ ربّي لا إلهَ إلاّ أنتَ خَلقْتَني وأنا عَبدُكَ وأنا على عَهدِكَ ووَعدِكَ ما استَطعتُ أعوذُ بِكَ مِنْ شرِّ ما صَنعتُ أبوءُ لكَ بِنِعمَتِكَ عَليَّ وأبوءُ لكَ بِذَنبي فاغفِرْ لي فانّهُ لا يَغفِرُ الذّنوبَ إلاّ انت إذا قالَ ذلك حينَ يُمسي فَماتَ مِنْ لَيلَتِهِ دَخَلَ الجنّة أو كان من أهل الجنّة وإذا قال ذلِكَ حينَ يُصبِحُ فَماتَ من يومِه...مثله»**(٣٧)

واتـە : شەددادی کوڕی ئەوس ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ ئەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبەرەوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ کە پێغەمبەر فەرموویەتی گەورەترین گووفتارێك کە داوای لێ بووردنی پێ بکەی لەخوا بریتی‌یە لەم پاڕانەوەیە « ئەی خوایە تۆ پەروەردگاری منی ، هیچ پەروەردگارێك نی‌یـە شیاوی پەرستن بێت بێجگە لەتۆ ، منت دروسـت کردوە ، وەمن بـەندەی تۆم وەمن لەسەر پەیمانو بڕیاری تۆم ، بەگوێرەی‌توانای خۆم پەنائەگرم بەتۆ لەو شتەی کەزیان بەخش بێت کـەخۆت دروستت کردووە بڕیار ئـەدەم وەدان بەوەدا ئەنێم کەنازو نیعمەتی خۆتت بەسەر مندا ڕشتووە ، وە دان ئەنێم بەوەدا کەتاوان بارم ، لـە تاوانـەکانم ببوورە ، هیچ کەس نی‌یە کەشیاوی لێ بووردن بێت بێجگە لـەتۆ » هـەرکەسێك ئەم پاڕانەوەیە بخوێنێت لەئێوارەدا ئەگەر لەو شەوەدا بمرێت بڕیاری خوای لەسەر بێ دەچێتە بەهەشتەوە ـ إنشاءَ الله ـ وە هەرکەسێك بەیانیان بیخوێنێت وە لەو ڕۆژەدا بمرێت هەمان شت ئەگەر خوای گەورە خواستی لەسەر بێت.

بەڵگەمان بۆووتنی « **سبحان الله ـ الحمد لله ـ الله اكبر** » هەریەکەی ـ٣٣ـ جار لە دوای نوێژە فەرزەکانەوە ئـەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە :

« عَنْ أبي هريرة ـ رضي الله عنه ـ إنَّ فُقَراءَ المهاجِرينَ أتوا رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ فقالوا ذَهَبَ أهلُ الدّثور بالدّرجات العُلى والنعيم المقيم ، يُصلّون كما نُصَلّي ويَصومونَ كما نصوم ولهم فَضلٌ من أموال ، يَحجّون بها ويعتمرون ويُجاهدون ويَتَصدّقونَ

فقـال : الا اعلمكم شيئا تدركون به من سبقكم وتسبقون بـه من بعدكم ولا يكون احد أفضل منكم إلا من صنع مثل ماصنعتم؟ قالوا : بلى يا رسول الله ـ قـال : تسبحون وتحمدون وتكبرون خلف كل صلاة ثلاثا وثلاثين » واتـه : ئەبو هورەیرە کەئاوی «عەبدولرەحمانە» ئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێت کۆمەڵێك لە هەژارانی کوچکەرەکان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ووتیان سـەروەتو سامان دارەکان پلـەیەکی بەرزیان هەیەو خاوەنی نازو نیعمەتی بەردەوامن نوێژ بـەجێ ئەهێنن وەکوئێمە ڕۆژوو ئەگرن وەکوئێمە لەگەڵ ئەوەشدا پلەیەکی گـەورەیان هەیە بەهۆی سامانەکەیانەوە ، فەرزی حەجی بێ ئەکەن وەعومرەی پـێ ئەکەن وە لەرێی خەباتو تێکۆشاندا لـە پێناوی ئیسـلامدا خـەرجی ئەکەن وە خەیرو چاکەی پێ ئەکـەن ئێمـە هیچمان نی یـە لەسەروەت وسامان هـەتا بمانگـەیێنێتە پلەی ئـەوان پێغەمبـەر ـ صلى الله عليـه وسلم ـ فەرمووی ئایا شتێکتان پیشان بدەم بەهۆی ئەوشتەوە بگـەنە ئەوپلەیەی کە دەوڵەمەندەکان هـەیانە وە هەرکـەسێك لـە موسڵمانان هەتاکۆتایی ژیانی ئەوشتە بەجێ بهێنێ پلەی دەوڵەمـەندەکانی دەست دەکەوێت کە بەهۆی ئەو سەروەتو سامانەوە بەدەستیان هێناوە ، وە هیچ کەسێك خاوەنی ئەو پلەیەنی یە مەگەر کەسێك وەکو ئێوە ئەوشتە بکات ... کۆمەڵی هەژارە کۆچەرەکان فەرموویان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەمان پێ بڵێ بگەینـە پلـەی دەوڵەمەندەکان پێی ، پێغـەمبەر فەرمووی : لەدوای هەموو نوێژە فەرزەکانەوە ـ٣٣ـ جار «سبحان الله» بکەن وە ـ٣٣ـ جار «الحمد لله» بکەن وە ـ٣٣ـ جار «الله اکبر» بکـەن کە بەهەموویەوە ئەکاتە ـ٩٩ـ بۆ تەواو کردنی ـ١٠٠ـ جار کۆتایی پێ ئەهێنرێ بە ووتنی « الله أكبر كبيرا والحمد لله كثيرا سبحان الله بكرة وأصيلا لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد يحيي ويميت بيده الخير وهو على كل شيء قدير » .

# نوێژەکانو ژمارەی ڕکاتەکانیانو کاتەکانیان

١ ـ نوێژی بەیانی : دوو ڕکاتەو یەك تەحیاتی تیا ئەخوێنرێت ڕکاتی یەکەم سورەتی فاتیحەی تیا ئەخوێنرێتو چەند ئایەتێ لە قورئانی پیرۆزو بەجێ هێنانی ڕکوعو سوجدەکان ، دوای ئەمە هەستانەوە لەسوجدەکان ، ئینجا ڕکاتی دووەم بەهەمان شێوە ئینجا تەحیاتی تیا ئەخوێنرێت هەتا کۆتایی ، نوێژی بەیانی کاتەکەی لەدوای بانگی بەیانی‌یەوە دەست پێ‌ئەکات هەتا خۆر هەڵاتن دوای خۆر هەڵاتن کاتی نوێژ تێپەڕی کردوەو دروست نی‌یە ٠

٢ ـ نوێژی نیوەڕۆ : چوار ڕکاتەو دوو تەحیاتی تیا ئەخوێنرێت لەرکاتی دووەمدا هەتا « اللهم صلّ علی محمد»ەوە لەڕکاتی چوارەمدا هەتاکۆتایی وەکاتەکەی لەدوای بانگی نیوەڕۆوە دەست پێ‌ئەکات هەتا کاتی هاتنی بانگی عەسر ٠

٣ ـ نوێژی عەسر : چوار ڕکاتەو دوو تەحیاتی تیا ئەخوێنرێت هەروەکو نوێژی نیوەڕۆ ، وە کاتەکەی لەدوای بانگی عەسرەوە دەست پێ ئەکات هەتا خۆر ئاوابوون ٠

٤ ـ نوێژی ئێوارە : سێ ڕکاتەو دوو تەحیاتی تیا ئەخوێنرێت لەڕکاتی دووهەمو سێ هەمدا وەکاتەکەی لەدوای بانگی ئێوارەوە دەست‌پێ ئەکات هەتا کاتی لاچوونی سوورایی ئاسمان ٠

٥ ـ نوێژی خەوتنان : چوار ڕکاتەو دوو تەحیاتی تیا ئەخوێنرێت هەروەکو نوێژی عەسرو نیوەڕۆ وەکاتەکەی لەدوای بانگی «عیشا» وە دەست پێ ئەکات هەتا کاتی هاتنی بانگی بەیانی ٠

# نوێژ بەچی بەتاڵ ئەبێتەوە ؟

نوێژ بەیەکێ لەمانەی خوارەوە بـەتاڵ ئەبێتەوە و پێویستە ئـەو نوێژە بکرێتەوە :

١ ـ خواردنو خواردنەوە : بەمەرجێك بزانێت کـە لەنوێژدایـە بەڵام ئەگەر بەھەڵەو نەزانین بێ زیانی نی‌یە ، ئەو خواردنو خواردنەوەیە کەمبێ یازۆر زیانی وەك یەکـە ، ئەگـەر تامی خواردنێك لەدەمدا بوو لەگەڵ تفدا قووت بدرێت نوێژی پی بەتاڵ ئەبێتەوە ٠

٢ ـ پێ کەنین کەمبێ یان زۆر بەزانینەوە یابە ھەڵە ٠

٣ ـ قسە کردنێك کە پەیوەندی بەنوێژەکـەوە نـەبێت ، بـەڵام ئەگەر بەھەڵەو نەزانینـە وە بێت نوێژی پێ بەتاڵ نابێتەوە ٠ پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێ : « إنَّ هذهِ الصَّلاة لا يَصْلُح فيهـا شيءٌ مِنْ كـلام النَّاس إنَّمـا هيَ التَّسبيح وَالتكبير وَقـراءة القرآن(٣٨) » واتە : بەڕاستی نوێژ لەگەڵیدا ناگونجێ ووتەی ئادەمیزاد واتە قسەیەکی تیکەڵ ناکرێت کە پەیوەندی بەنوێژەوە نەبێت ، چونکە نوێژ بریتی‌یە لە کردنی «سبحان الله والله اكبر»و خوێندنی قورئان ٠

بێجگە لەمانە نوێژ تووشی زیانی ھەڵوەشانەوە ئەبێت ٠

ئەگەر یـەکێك لـەنوێژدا بوو ڕووداوێکی سامناکی بینی ئەتوانێ دەوروبـەری بـەووتنی «سبحان الله» ئاگادار بکاتـەوە ، یـا پێش نوێژ ھەڵەیەکی کرد نوێژکەر بۆی ھەیە لـەنوێژە کـەیدابڵێ « سبحان الله » وەئەبێ مەبەستیشی لەووتنەکە یاد «ذکر»ی خوابێت لەدڵەوە ئەمە بۆپیاو، بەڵام ئەگەر ئافرەت لـە نوێژدا بوو ڕووداوێکی بینی ئـەبێ سێ جـار دەستی ڕاستی بدات بەسەر دەستی چەپیدا ٠ پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێ : « مَنْ نابَهُ شيءٌ في صلاتـه فَلْيُسَبِّحْ فانَّما

---

٣٨ ـ رواه احمد ومسلم وابو داود ٠

التصفيق للنساء » واته : ئەگەر ڕووداوێك ڕوویدا لە نوێژدا بوو بۆپیاو با « سبحان الله » بكات چونكە دەستدان بەسەر دەستدا بۆ ئافرەت ئەبێ ٠

ئەگەر كەسێك لە نوێژەكەیدا حاڵی وابوو كە گریانی ئەهات یا ناڵاندنێكی كەم ئەتوانێ بەرگری خۆی بكات وە نوێژەكەی بەتاڵ نابێتە وە چونكە « عەبدوڵلای كوڕی شەخیر » فەرموویەتی : « رَأيْتُ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ يُصَلّي وفي صَدْرِهِ أزيز كأزيز المِرْجَلِ مِنَ البكاء »(٣٩) واتە : بینیم پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ نوێژی ئەكرد زیكەی سنگی ئەهات لەگریاندا وەكو زیكەی قازانێكی پڕ لەئاوی كوڵاو كە لەسەر ئاگربێ ٠

٤ ـ جووڵانەوەی زۆر كەپەیوەندی بەنوێژەكەوە نەبێت ، بەڵام ئەگەر دوو هەنگاو لە نوێژدا بنرێت وە كورڕۆیشتنە پێشەوەی پیشەوا بۆ ئەوەی «جەماعەت» پێك بێت یان ڕۆیشتنە دواوەی كەسێك لەڕیزی جەماعەتدا بێت بۆ هاوڕێ یەتی یەكێكی تر بۆئەوەی ڕیز دروست بێت زیانی نی یە چونكە ئەبو هورەیرە فەرموویەتی : « إنَّ النبيَّ أمَرَ بِقتلِ الأسْوَدَينِ في الصَّلاةِ العَقْرَبُ والحيَّة »(٤٠) واتە : پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمانی داوە بەكوشتنی دووپشكو مار لە نوێژدا ٠ لەمەزیاتر جمو جۆڵ بكرێت لە نوێژدا بەبێ هودە نوێژ بەتاڵ ئەبێتەوە ٠

٥ ـ هەڵوەشانەوەی یەكێك لەمەرجەكانی نوێژ ، وەكو بێ دەست نوێژ بێت یا یەكێ لە پایەكانی نوێژی بەجێ نەهێنا یاعەورەتی دەركەوت یان ڕووی لەڕووگە هەڵچەرخان ٠٠٠ هتد نوێژی پێ بەتاڵ ئەبێتەوە ٠

---

٣٩ ـ رواه احمد وابو داود والنّسائي ٠

٤٠ ـ رواه الخمسة ٠

# ئەو شتانەی کەبێ هوودەن لەنوێژدا

ئەو شتە بێ هوودانە هەرچەندە نوێژیان پێ بەتاڵ نابێتەوە بەڵام بەنەکردنی ئەو شتە بێ هوودانە پلەو پایەی نوێژ بەرزتر لەبێتەوە ، وە بەنوێژێکی ڕێكو پێك ئەدرێتە قەڵەم لەیاسای ئاینی ئیسلامدا · پێغەمبەر ئەفەرمووێ : « ان أحدَكم إذا اقام في صلاته فانه يناجي ربه أو انَّ ربه بينه وبين القبلة »(٤١) ، واتە : هەرکاتێك یەکێ لەئێوە هەستا بۆ بەجێ هێنانی نوێژ وتوووێژ لەگەڵ خودا ئەکات ، یا بەڕاستی پەروەردگار لەنێوان نوێژکەرو ڕووگەدایە ، لـەم فەرموودە یەی پێغەمبەرەوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ بۆمان ڕوون ئەبێتەوە ئەبێ نوێژکەر هەستی ئەوەی هەبێ کە «مواجهە»ی خوای کردوە ئەبێ ئاگاداری خۆی بێو دڵو دەروونی لە هەموو شتێك خاڵی بکات سـەری بەندایەتی وشـەرم دانەوێنێ سـەیری سوجدەگای بکات بەهیوای بەزەیی خوابێت ·

ئەو شتانەش کەبێ هوودەن لەنوێژدا ئەمانەی خوارەوەن :

١ ـ نابێ بە هیچجۆرێك کردەوەیەکی ناپەسەند بکات کەنوێژکەر دوور بخاتەوە لەڕەوشتو شەرم لەنوێژەکەیدا ·

٢ ـ نابێ نوێژکەر سەیری دەورو بەری خۆی بکات · حـەزرەتی عایشە دایکی موسڵمانان فەرموویەتی : سألتُ رسول الله عَن التَّلَفُّت في الصلاة فقال : « إختِلاسٌ يَختَلِسهُ الشيطان مِنَ العَبد » ـ رواه البخاري ـ واتە : پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە بابەت لاکردنە وەو ئاوڕدانەوەو سەیرکردنو خۆبێ ئاگاکردن لەنوێژدا : فەرمووی ئەوە بیرتێك دانێکە شەیتان ئەیهاوێتە دڵی بەندەکانی خواوە·

٣ ـ سەیرکردنی دیمەنو وێنەیەك کـەنوێژ کـەر بێ ئاگا بکـات لە نوێژ ·

---

٤١ ـ رواه البخاري ·

ـ ئەنس ـ بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێ « كانَ قرامٌ لِعائِشَة سترت به جانب بيتها فقالَ لها النبي : أميطي عَنّي قِرامَك فانه لاتزال تصاويرُهُ تعرض لي في صلاتي »(٤٢) واتە : حەزرەتی عایشە پەردەیەكی ڕەنگاو ڕەنگی هەبوو لەدیواری ژوورەكـەیدا هەڵیوا سیبوو پێغەمـبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی ئەی عایشە ئەم پەردە ڕەنگاو ڕەنگە لەمن دوور بخەرەوە چونكە وێنەكانی لەكاتی نوێژدا دیارن لەمنەوە ٠

٤ ـ نوێژ كردن لەكاتی ئامادە بوونی خواردن وخواردنـەوە بـە مەرجێك نوێژكەر ئارەزووی بكات باش وایە خواردنەكە بخوات ئینجا نوێژەكەی بكات ، یا دەست نوێژەكەی قورس بێت ٠ چونكـە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویـەتی : « لا صلاة بحَضرة الطعـام ، ولا هو يدافعه الاخبثان لأن ذلك يصرف المصلي عن الخشوع في صلاته » واتە : نوێژی تەواو نی‌یە كەسێك كە لەكاتی خواردندا یا لە كاتێكدا كە پێویستی بەسەر ئاوبێت چونكە ئەم حاڵەتانە نوێژكەر ڕائەكێشت بۆ بێ ئاگایی لەنوێژ ٠

٥ ـ چاو نووقاندن لەكاتی نوێژدا ، مەگـەر سوودی نوێژەكـەی تێدابێت ٠

٦ ـ باوێشك دان لـە نوێژدا پێغەمبەر ـ صلى الله عليـه وسـلم ـ ئەفـەرمووێ : « التثـاؤب من الشيطان فـاذا تثاوب أحدكـم فليكظـم ما استطاع في الصلاة »(٤٣) واتـە : باوێشك لەشەیتانەوەیە هـەركاتێك یەكێك لەئێوە باوێشكیدا با قەدەغەی بكات لەخۆی بـەگوێرەی توانای لەنوێژدا بەتایبەتی وە بەگشتی لەكاتەكانی تردا بێجگە لەنوێژدا پشتی دەستی ڕاستی بگرێت بەسەر دەمیدا ٠

٧ ـ نوێژكردن لەزبلگادا یا لـە حەمامدا یان لەهـەرشوێنێك كـە

---

٤٢ ـ رواه احمد والبخاري ٠

٤٣ ـ رواه الترمذي ٠

بەپیس بزانرێت ٠

٨ ـ بەرزکردنەوەی چــاوو نواڕین بۆ ئاســمان لــەکاتی نوێژدا پێغەمبەر فەرموویەتی : « مابالُ اقوام یرفعونَ أبصارهُمْ الی السَّماء في صلاتهم فاشتهر قوله في ذلك حتــى قال : لینْتَهِیَن أو لتخطفنّ أبصارَهُم »(٤٤) واتە : ئای بۆحالی ئــەو کــەسانەی کــەچاویان بــەرز ئەکەنەوە لەکاتی نوێژدا بۆئاسمان ـ بەفراوانی وبەتوندی چووبە قوولایی فەرموودە کەیدا بەرامبەر بەوکە سانەی کەبەرگری چاویان ناکەن ،هەتا فەرموویەتی باواز بهێنن لەو حالە ئەگەرواز نەهێنن خۆیان ئامادە بکەن بۆ کوێربوونی چاوەکانیان ٠

٩ ـ دانانی دەست لــەســەرناوك لــەکاتی خوێندنــی فاتیحــەدا یاقورسایی لەشی بخاتە سەرلایەکی ٠

١٠ ـ هێما «ئیشارەت» کردن بەچاو یان بەبرۆ یا هەرئەندامێکی تری لەش لەکاتی نوێژدا ٠

١١ ـ دەست دانان لەپێش ئەژنۆدا لەکاتی سوجدە بردنا مەگــەر کەسێك وای بۆرێك بکەوێت ٠

١٢ ـ دانیشتن بۆنوێژ ئەژنۆکانی هــەڵبدا لــەکاتی خوێنــدنی تەحیاتدا ٠

١٣ ـ هەڵکردنی جلو بەرگ لەکاتی چوون بۆسوجدە ٠

١٤ ـ داگیرکردنی شوێنێکی تایبەتی بۆنوێژ بێجگە لەپێش نوێژ ٠

١٥ ـ نوێژکردن لەدوای ڕیز «صف» یەکەوە بە مەرجێك لەڕیزی جەماعە تەکەدا جێگەی ببێ ٠

---

٤٤ ـ رواه الجماعة إلا مسلماً والترمذي ٠

١٦ ـ پشت گوێ خستنی یەك لەدوای یەكی سورەتەكانی قورئان كە لە دوای سورەتی فاتیحەوە دەخوێنرێت • پێویستە لە سورتی «البقرة» وە دەست پێ بكات بەرەو خوار ، نابێ لە سورەتی «النّاس»ە وە بەرەو ژوور دەست پێ بكات وەهەر سورەتو ئایەتێ ئەخوێنرێت لەنوێژدا لەدوای سورەتی فاتیحەوە پێویستە بەم جۆرەبێت •

١٧ ـ پشت گوێ خستنی داڕشتنی سورەتەكانی قورئان كە لەدوای فاتیحەوە ئەخوێنرێت ئەبێ لەسەرەوە دەست بكات بۆ خوارەوە• بۆ نمونە ئەگەر لە ڕكاتی یەكەمی نوێژەكەیدا سورەتی «الفلق»ی خوێند ئەبێ لەڕكاتی دووەمدا سورەتی «النّاس» بخوێنێت چونكە سەرەتای قورئان لە سورەتی فاتیحەوە دەست پێ ئەكات لەم حاڵەدا مەبەستمان ئەوەیە بەپێی توانا سورەتەكان یەك لەدوای یەك بخوێنێت نەك سورەتێك لە ناوەڕاستی قورئانداو سورەتێك لە كوتایی قورئاندا •

# بانگ‌و قامه‌ت

بانگ : ئاگادار کردنه‌وه‌ی مووسلمانانه به هاتنی کاتی نوێژ ، بانگ به چه‌ند ووشه‌یه‌کی تایبه‌تی دارێژراوه ، وه‌فه‌رزی «کیفایه»یه واته پێویسته له ناو کۆمه‌ڵی مووسلمانانندا یه‌ك که‌س بانگ بدات بۆئه‌وه‌ی تاوان له ئه‌ستۆی کۆمه‌ڵه‌که‌دا نه‌مێنێت خوای گه‌وره ئه‌فه‌رموێ « وإذا نادیتم الی الصلاة » وه پێغه‌مبه‌ری خوا ئه‌فه‌رمووێ : « إذا حضرتم الی الصلاة فلیؤذن لکم احدکم ثم لیؤمکم اکبرکم »(٤٥) واته : هه‌رکاتێ کاتی نوێژ هات بابانگ بدات بۆ ئێوه یه‌کێکتان ئینجا پێش نوێژی تان بۆ بکات گه‌وره‌که‌تان .

بانگ دان سوننه‌ته بۆنوێژه فه‌رزه‌کان بۆکه‌سێك که گوێی له ده‌نگی بانگی گشتی نه‌بێت له گه‌شتدا بێت یان نیشته‌جێ بێت .

ووشه‌کانی بانگ بریتین له «الله اکبر، الله اکبر، الله اکبر، الله اکبر، اشهد ان لا إله إلا الله، اشهد ان لا إله إلا الله - اشهد انمحمدا رسول الله ، اشهد انّ محمدا رسول الله - حي علی الصلاة ، حي علی الصلاة - حي علی الفلاح ، حي علی الفلاح - الله اکبر ، الله اکبر - لا إله إلا الله » سوننه‌ته بۆ بانگی به‌یانی له‌پێش ووتنی «الله اکبر کوتای» بووترێت « الصلاة خیرٌ من النوم » دووجار هه‌رچه‌نده بانگ ووشه‌کانی که‌م ئه‌نوێنێ به‌دیه‌ن به‌ڵام چه‌نده‌ها فه‌لسه‌فه‌ی به‌نرخی تیایه چونکه :

١ - بانگ به‌ڕسته‌ی - الله اکبر - ده‌ست پێ ئه‌کات ئه‌مه‌ش نیشانه‌ی سه‌لماندنی بوونی خوایه‌کی گه‌وره‌و به‌ده‌سه‌ڵات ئه‌گه‌یێنێ که هیچ که‌س له‌و گه‌وره‌تر نی‌یه .

٢ - اشهد ان لا إله إلا الله - ئه‌وه ئه‌گه‌یێنێت که‌هیچ که‌سێك نی‌یه

---

٤٥ - رواه مسلم والبخاري .

لەم جیهانەدا کە شیاوی پەرستن‌و خاوەنیەت «ملکیة»بێت بێجگە لەخوا ٠

٣ ــ اشهد ان محمدا رسول الله ئەوە ئەگەیێنێت کەپێغەمبەر ــ صلی الله علیه وسلم ــ ڕەوانــە کراوی خوایەو هێنــەری قورئانی پیرۆزە وە بانگەوازکەرێکی ڕاستەقینەی خوایە ٠

٤ ــ حي علی الصلاة ــ ئەوە ئەگەیێنێ کەهەرکەسێك باوەڕی بەخوا هەبێت‌و بەڕەوانەکردنی پێغەمبەر لەلایەن خواوە ئەبێ نوێژ بەجێ بهێنێ کەواتە نوێژ مەرجی سێیەمی ئایینی ئیسلامە ٠

٥ ــ حي علی الفلاح ــ ئەوە ئەگەیێنێت کــەڕێگــای ســەرکــەوتن‌و بەختیاری هەمیشەیی لەئایینی ئیسلامدایە ، ئەمەش نیشانەیە بۆزیندو بوونەوەی پاش مردن لە جیهانێکی تری نەبڕاوەدا ٠

کەواتە بانگ کاکلەی فەرمانە هــەرە بەرزەکانی ئایینی ئیسلامی گرتۆتە ئەستۆ هەرکەسێك باوەڕی بەووشەکانی بانگ نــەبێت بــەبێ باوەڕ ئەژمێررێت کێشی بۆدانانرێت لە تەرازووی ئاییندا ٠

قامەت : ئاگاداری کردنە بۆ هــەڵسان بۆ بــەجێ هێنانی نوێژ کردنی قامەت سوننەتە هەروەکو بانگ بە چەند ووشەیــەکی تایبــەتی دیاری کراوە ، بەڵام مەرجی قامەت ئەوەیە لەهەڵسانی نوێژەکە نەپچڕێت بە شتێکیتر ، کاتێك کەقامەت‌کرا ئــەبێ مووسڵمانان یــەکسەر دوای قامەت خەریکی نوێژ کردن‌بن ، ئەگــەر شتێك خرایــە نێوان قامــەت‌و نوێژەوە بەشتێکی بێگانە لەنوێژەکە ٠ ئەبێ سەرلەنوێ قامەت بکرێتەوە دۆعای نێوان قامەت‌و نوێژ لەپێغەمبەرەوە نەبیستراوە بەڵام دۆعای نێوان بانگ‌و قامەت سوننەتــە چونکــە پێغەمبەر ــ صلی الله علیــه وســلم ــ فەرموویەتی: « الدعاء لا یرد بین الآذان والاقامة »(٤٦) واتە: پاڕانەوەی نێوان بانگ‌و قامەت نادرێتە دواوە لەلایەن خواوە ٠

---

٤٦ ــ رواه احمد وابو داود والترمذي ٠

**ووشەكانی قامەت :**

« الله اكبر ، الله اكبر ــ اشهد ان لا إله إلاّ الله ، اشـهد انّ محمدا رسول الله ، حَيّ على الصلاة ، حَي عـلى الفلاح ، قـد قامت الصلاة قد قامَت الصلاة،الله اكبر،الله اكبر ــ لا إله إلا الله » سوننەتە گوێگرانی بانگو قامەت بەوێنەی بانگ دەرو قامەتكەر بڵێنەوە بێجگە لە « حي على صلاة ، حي على الفلاح » گوێ گر ئەڵێن « لا حَوْلَ وَلا قوّةَ إلاّ بالله » إبن مَسعود ــ فەرموویەتی من لەخزمـەتی پێغەمبـەر دابووم ووتم « لا حـول ولا قوّة إلا بالله » پێغەمبەر ــ صلى الله عليـه وسلم ــ فەرمووی ئـەزانی مانای چی‌یە ؟ منیش ووتم نـەخێر ئـەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی «لا حَوْل» واتە هیچ هێزێك نی‌یە ئادەمیزاد بپارێزێت لەبێ فەرمانی خوا بێجگە لـە یارمەتی خوا «ولا قوّة» واتـە هیچ هێزێك نی‌یە كەیارمەتی ئادەمیزاد بدات بۆ فـەرمان بەرداری خوا بێجگە لەخوا خۆی ، ئینجا پێغەمبەر ــ صلى الله عليه وسلم ــ بە هەردوو دەستی پیرۆزی دای بەشانمدا ، فەرمووی حـەزرەتی جوبرەئیل ــ بەم جۆرە گەیاندویەتی بەمن . لەبانگدا گوێگر چوارجار بەرامبەر بە « حي على الصلاة وحي عـلى الفـلاح » ئـەڵێت « لا حـول ولا قوة إلا بالله » وەبەرامبەری « حي على الصلاة وحي على الفلاح » دووجار ئەیلێت لەقامەتدا. وە بێجگە لە « الصلاة خيرٌ من النوم »لە بانگی بەیانیدا گوێگر ئەڵێت « صَدَقْتَ وبَرَرْتَ » سوننەتـە لـەدوای بانگـەوە سلاوات بدرێت ئـەم پـاڕانـەوە یـەش بخـوێنرێـت . « عَـنْ جـابـر ان النبـي قال [ مَنْ قال حينَ يسمع النداء ــ اللهم رَبُّ هذه الدَّعْوَةَ التّامّة والصّلاة القائِمةَ آتِ مُحمداً الوَسيلة والفَضيلة وابْعثه مقاماً محموداً الذي وَعَدته ــ حَلّت له شَفاعتي يوم القيامة »(٤٧) واتە : هەركەسێك كاتێك كەبانگی بیست بڵێت : ئەی پەروەردگاری بێ وێنەبەدی هێنـەری

٤٧ ــ رواه الجماعة إلا مسلماً .

بانگەو قامەت بۆ بەدەست هێنانی نوێژ کە ڕێبازێکی ڕاستە قینەو شیاوە بۆڕزگاربوونی ئادەمیزاد لەهەردوو جیهاندا ، ببەخشە بە خۆشەویستی خۆت پێشەوای هەردووجیهان – محمد – صلى الله عليه وسلم پێغەمبەری سەردار بەرزترین پلەو پایەی ڕۆژی دوایی یابەرزترین جێگای بەهەشتی بەرین • ئەی خوای گەورە زیندووبکەرەوە پێغەمبەری خۆشەویستمان لە ڕۆژی دواییدا لەبەرزترین مەلبەندی داخوازیدا کەجێگای سوپاسی بەندەکانت بێت ، ئەو پلەو شوێنەی کەبەڵێنت داوە بە خۆشەویستەکەت بەجێی بهێنە چونکە تۆ پەیمانی خۆت ناگۆڕی • هەرکەسێك ئەم پاڕانەوەیە بخوێنێت لەدوای بانگ تکا «شەفاعەت»ی پێغەمبەری بۆئەبێ وەلە فەرموودەیەکی تری پێغەمبەردا ئەم بەڵێنەی داوەو فەرموویەتی : « مَن قال ذلك حينَ يسمع النداء حَلّت له شفاعتي يوم القيامة »(٤٨) واتە : هەرکەسێك لەدوای بانگ ئەودوعایەی کەباسمان کرد بڵێت پێغەمبەر ئەفەرمووێ تکای منی بۆئەبێ لەڕۆژی دواییدا • ئەم پاڕانەوەیە لەئایەتێکی قورئاندا دەست نیشان کراوە : « وَمِنَ اللَّيلِ فَتَهَجَّد بهِ نافلةً لَكَ عسى ان يَبعثكَ ربُكَ مقاماً محموداً »(٤٩) واتە : هەندێك لەکاتەکانی شەودا واز بێنە لە خەو بۆنوێژکردنی زیادە، لەفەرزەکان ئەم فەرمانەتایبەتی کراوە بەتۆوە هیوا هەیە لەپاداشتیی ئەم بەندایەتی‌یەوە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا پلەو پایەیەکی دیاری کراوت پێ ببەخشێ کە پلەی شەفاعەتی گەورەیە •

ئەگونجێ بێجگە لەبانگ دەر قامەت بکات بەڵام باشتر وایە بانگ دەر قامەت بکات چونکە پێغەمبەر – صلى الله عليه وسلم – فەرموویەتی : « مَن أذَّنَ فَهُوَ يُقيم الصلاة » واتە : هەرکەسێك کەبانگی دا بەو شیاوە قامەتیش بکات بۆ نوێژ •

---

٤٨ – رواه البخاري •

٤٩ – سورة – الاسراء – آية – ٧٩ –

هەندێك شت هەیە گەزیاد کراوە لەبانگدا لەئایینی ئیسلامدا بڕیاریان لەسەر نەدراوە وەکو سلاوات دان لەسەر پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ یان سروود خوێندنەوەی شەوانی هەینی لەدوای بانگ پێویستە ئەو شتانە نەکرێن • لەبەر ئەوەی ئێمە بۆمان نی یە هیچ شتێك زیاد بکەین لەیاسای ئاییندا یالێی کەم بکەینەوە • هەرکردوەیەك فەرمانی پێغەمبەری خوای لەسەر نەبێ بەزیادەو «بِدْعَة» ئەژمێررێت پێغەمبەری خوا لەفەرموودەیەکیدا ئەفەرمووێ : « مَنْ أحْدثَ في أمرنا هذا مالَيْسَ منه فَهُوَ رَدٌّ »(٥٠) واتە هەرکەسێك شتێکی تازە تێکەلی ئایین بکات وە هەرفەرمانو کردەوەیەك لەئاییندا فەرمانی پێ نەدرابێ ئەوە لێی وەرناگیرێت و بە هەلە ئەدرێتە قەلەم •

سلاوات دان لەسەر پێغەمبەر لەدوای بانگ سوننەتە بەلام نەك بەدەنگی بەرز چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی : « إذا سَمِعتُمْ المؤذن فقولوا مثل ما يقول ثمَّ صَلّوا عَلَيَّ فانه مَن صَلّى عَلَيَّ صلاة صَلّى الله بها عليه عشراً »(٥١) • واتە : هەر کاتێك گوێتان لەبانگ دەربوو بانگی دا ئێوەش وەکو ئەو بیلێنەوە بەبێ زیادو کەم لەدوای بانگەکە داوای ڕەحمەتی خوابکەن بۆ من ، هەرکەسێك داوای ڕژاندنی ڕەحمەتی خوا بکات بۆمن خوای گەورە دەجار ڕەحمەتو بەزەیی خۆی ئەڕژێنێ بەسەریا بەلام نەك بەشێوەی دەنگ بەرزکردنەوە چونکە چەندەها مووسلمان سەریان لێ تێك ئەچێ لەنوێژەکەیاندا لەمزگەوتا چونکە قورئان خوێندن قەدەغەیە لەمزگەوتدا بەدەنگی بەرز کاتێك موسلمانێك نوێژ بکات نەك سلاوات دان بەدەنگی بەرز ؟!

---

٥٠ ـ رواه الترمذي والبخاري •
٥١ ـ رواه الجماعة إلا البخاري وابن ماجة •

# نوێژه سوننه‌ته‌كانی پاش وپێشی نوێژه فه‌رزه‌كان

نوێژه سوننه‌ته‌كانی پاش‌و پێشی نوێژه فه‌رزه‌كان دوو به‌شن :

یه‌كه‌م : سوننه‌تی «مؤكد»ئه‌و نوێژانه‌ن كه‌پێغه‌مبه‌ر ـ صلى الله عليه وسلم ـ به‌به‌رده‌وامی كردوویه‌تی وه‌ئه‌و نوێژانه‌ش ئه‌مانه‌ن :

١ ـ دوو ڕكات پێش نوێژی به‌یانی ·

٢ ـ دوو ڕكات پێش نوێژی نیوه‌ڕۆ ·

٣ ـ دوو ڕكات پاش نوێژی نیوه‌ڕۆ ·

٤ ـ دوو ڕكات پاش نوێژی ئێواره ·

٥ ـ دوو ڕكات پێش نوێژی عه‌سر ·

٦ ـ دوو ڕكات پاش نوێژی خه‌وتنان ·

دووه‌م : سوننه‌تی «غير المؤكّد» ئه‌و نوێژانه‌ن كه‌پێغه‌مبه‌ر ـ صلى الله عليه وسلم ـ به به‌رده‌وامی نه‌ی كردوون ، ئه‌وانیش ئه‌مانه‌ن :

١ ـ دووڕكات پێش نوێژی دووڕكاته «مؤكد»ه‌كه‌ی پێش نوێژی عه‌سره‌وه واته به‌دووڕكاته «مؤكد»ه‌كه‌وه ئه‌بن به چوارڕكات ·

٢ ـ دووڕكات پێش نوێژی ئێواره ·

٣ ـ دووڕكات پێش نوێژی خه‌وتنان ·

پێغه‌مبه‌ر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فه‌رموویه‌تی : « بين كل أذانين صلاة ـ قالها مرتان ـ ثم قال في الثالثة لِمَن شاء »(٥٢) واته له‌نێوانی هه‌ردوو بانگێكدا دووڕكات نوێژ هه‌یه دووجار ئه‌م فه‌رمایشته‌ی فه‌رمووه هه‌تا جاری سێیه‌م فه‌رمووی بۆ كه‌سێك كه ئاره‌زووی هه‌یه ·

---

٥٢ ـ رواه الجماعة ·

ئەم سوننەتانە باشتر وایە لەماڵەوە بکرێن چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی : « أفضل صلاة المرء في بيته إلاَّ المكتوبة »(٥٣) واتە : باشترین نوێژ بۆ پیاو ئەوەیە لەماڵەوە بیکات بێجگە لە نوێژە فەرزەکان، وە هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا ئەفەرمووێ : « إجعلوا من صلاتكم في بيوتكم ولا تتخذوها قبوراً »(٥٤) واتە هەندێك لە نوێژەکانتان لەماڵەوە بکەن وە ماڵەکانتان وەکو گۆڕستان لێ مەکەن کە نوێژیان تێدا نەکرێت وەلەم فەرموودەیەشەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە نوێژ کردن لەسەر گۆڕستان قەدەغەیە ٠

---

٥٣ ـ رواه الجماعة إلاّ ابن ماجة ٠

٥٤ ـ متفق عليه ٠

# شەو نوێژ « صلاة الليل »

شەو نوێژ سوننەتێکی گەورەی پێغەمبەرە ـ صلى الله عليه وسلم ـ قورئانی پیرۆز موسڵمانان هان ئەدات بۆ بەجێ هێنانی شەو نوێژ ، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرمووێ : « إنَّ المُتَّقِينَ في جَنَّاتٍ وعُيون آخِذين ما آتاهُمْ رَبُّهُمْ إنَّهُمْ كانوا قبلَ ذلكَ مُحسِنِينَ كانوا قليلاً مِنَ اللَّيلِ ما يَهْجَعُون وبالأسْحارِ هُمْ يَستغفرونَ »(٥٥) واتە : بەڕاستی ئەوانەی کەخۆیان لە پارێزن لەتاوان لە چەند بەهەشتو سەرچاوەیەکدان ، ڕەوشتیان وایە ئەوەی کە خوا پێی داون وەری ئەگرن چونکە بەڕاستی لەپێش ڕۆژی دواییدا واتە لەجیهاندا خاوەن چاکەبوون وە ڕەوشتیان وابوو کەمێك لەشەودا ئەنووستن خەریکی شەونوێژو بەندەیی بۆ خوابوون وەلەکاتی بەرەبەیاندا داوای لێ بووردنیان ئەکرد ٠

ئایەتو فەرموودەی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەبارەی شەونوێژەوە زۆر هاتووە شوێنی نووسینیان لێرەنییە ٠ ئەبی هورەیرە فەرموویەتی پرسیار کرا لە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ گەورەترینو بەنرخترین نوێژ لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە کامەیە ؟ پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی نوێژێکە لەنیوەی شەودا بکرێت « سُئِلَ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ أيَّ صلاة أفضل بعد المكتوبة ؟ قال الصلاة في جوف الليل »(٥٦) کاتێك دەستی کردوە بەشەو نوێژ دووڕکاتی خێرای کردوە ئینجا یازدە ـ١١ـ ڕکاتی تری کردوە دووڕکات دووڕکات ، لەدوای هەموویانەوە یەك ڕکاتی تاکی

---

٥٥ ـ سورة الذاريات ـ ١٥ ـ ١٨

٥٦ ـ رواه الجماعة إلا البخاري ٠

کردووە ئەم ڕکاتە تاکەیێی ئەوتریێ نوێژی «وەتر» پێغەمبەر ـ صلى الله علیـه وسلم ـ فەرموویـەتی : « أوتِروا یااهل القرآن فان الله وتر »(٥٧) واتە : نوێژی وەتر بکەن ئەی هـەلگرانی قورئان خوای گـەورە تاکـەو کردەوەی تاکی خۆش ئەوێت ، شەو نوێژو نوێژی وەتر دەست پێ ئەکات لەدوای نوێژی خەوتنانەوە هەتاپێش نوێژی بەیانی .

## نوێژی تەراویح « صلاة التراویح »

نوێژی تەراویح سوننەتێکی گەورەیە بۆ پیاوانو ئافرەتانی موسڵمان وەسوننەتە بەکۆمەل «جماعة» بکرێت هەروەکو چۆن سوننەتە بـەتایش بکرێت بەڵام باش وایە لە مزگەوتدا بکرێت .

بوخاری ومسلیم ـ ئەگێڕنەوە پێغەمبەر ـ صلى الله علیه وسلم ـ لەنیوەی شەودا لەکاتی ڕەمەزاندا تەشریفی بردووە بۆ مزگەوت لەشەوە تاکەکانی دوای ـ٢٠ـی ڕەمـەزان لـەشەوەکانی ـ٢٣ـ٢٥ـ٢٧ـ نوێژی کردووە لەمزگەوت وەیارانیشی بەکۆمەڵ لەخزمەتیا نوێژیان کردوە هەتا هەشت ڕکات نوێژی تەراویحی بۆ کردوون ئەوانی تریان لەماڵەوە کردوە بەهەموویانەوە بووە بـەبیست ڕکات وەحەزرەتی «عومەر» ـ خوای لـێ ڕازی بێ ـ لەسەردەمی جێ نشینی «الخلافة» خۆیدا بڕیاری دا کەبیست ڕکات نوێژی تەراویح بکرێت لەمزگەوتدا ، یارانی پێغەمبەر هیچ دژایەتی یەکیان دەرنەبڕی حەزرەتی «عثمان» ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ فەرمووی ئەی عومەر خوا پاداشتت بداتەوە مزگەوتەکانت ئاوەدان کردەوە .

ئێمەی موسڵمان پێویستە لەسەرمان ڕێبازی پیرۆزی یارانی پێغەمبەر بەدڵو بەگیان وەرگرین چونکـە لەهەموو ڕوویەکەوە خاوێنو پاك بوون

---

٥٧ ـ رواه الخمسة .

لەوەدا کەزیادەیەك بخەنە سەرئایینی پاکی ئیسلام بەتایبەتی ئـەگـەر پێغەمبەر ـ صلی الله علیە وسلم ـ ڕای لەسەر نەبووبێ لەبەر ئەوەی ئایینی پاکی ئیسلام بەتایبـەتی فەرموودەکانی پێغەمبەر لـەوانەوە گەیشتوون بەئێمە ، زۆر هـەڵەیە بۆ ئەوکەسانەی کـەئەڵێن ئێمە نوێژی تـەراویح بەکۆمەڵ ناکەین چونکە پێغەمبـەر نەیکردووە ، پێغەمبـەر لەبەرئـەوە لەگەڵ یـارانیدا بەکۆمەڵ بـەردەوام نوێژی تـەراویحی نـەکردوە ترسی ئەوەی هەبووە کەخوای گەورە فەرزیان بکات ئـەو کاتـە زۆر ئەرکێکی گران ئەبوو لەسەر موسڵمانان بەگشتی وەنەیان ئەتوانی نوێژی تەراویح بکەن چونکە پێغەمبەر ـ صلی الله علیـە وسلم ـ کاتێك خوای گـەورە ئارەزووی دوو شتی پێ دابێ کامەیان ئاسانتر بووبێ ئەوەیانی وەرگرتووە بۆ موسڵمانان ٠ نوێژی تـەراویح لـەپاش نوێژی خـەوتنان دەست پـێ ئەکات هەتایێش نوێژی بەیانی بەڵام باش وایە سوننەتی وەتر بخرێتـە پـاش نوێژی تـەراویح چونکـە پێغـەمبەر ـ صلی الله علیـە وسـلم ـ فەرموویەتی :

« إجْعَلوا آخِرَ صَلاتكم مِنَ اللّيلِ وَتْراً » واتـە : وابکـەن کەدوا ترین نوێژتان لەشەودا سوننەتی وەتر بێت ٠

# ئەو نوێژە سوننەتانەی کە بەهۆیەکەوە ئەکرێن

١ ـ نوێژی مزگەوت « تَحِيَّةِ المَسْجِدْ » :

نوێژی مزگەوت دوو ڕکاتە سوننەتە بۆ هەموو کەسێك کاتێ کە ئەچێتە مزگەوتەوە قاچی ڕاستی پێش بخات وەبەدڵێکی بەندایەتی یەوە بچێتە مزگەوتەوە وەبزانێ کە ئەبێ بەمیوانی خوا وە ئەچێتە گەورەترین وپیرۆزترین پارچەی زەوی یەوە چونکە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی : « پیرۆز ترین پارچەی زەوی لەم جیهانەدا مزگەوتە » ڕێزی مزگەوت لەتوانای پێنووسدانی یە کەباسی بکات وەبە چەندەها نووسراوی گەورە گەورەش باس ناکرێت بەڵام بەم ئایەتە کۆتایی پێ ئەهێنن : « وإنَّ المَسَاجِدَ للهِ فلا تَدْعُوا معَ اللهِ أحدا »(٥٨) واتە : ئەی ڕەهبەر فەرموو کەمزگەوتەکان بۆ خوان و ماڵی ئەون ، چونکە ئەو مزگەوتانە بۆ بەندایەتی تێدا کردن دروست کراون وەبەندایەتی کردنیش هەر بۆ خوایە ئیتر لەخوا بەولاوە لەمزگەوتدا کەس بانگ مەکەن و بێجگە لەخوا ناوی کەس لە مزگەوتەکاندا مەبەن و کەس مەکەن بەهاوبەش بۆخوا •

سوننەتەکاتی چوونە ناومزگەوت ئەم نزاو پاڕانەوەیە بخوێنرێت:

« اللَّهُمَّ اغفر لي ذنوبي وافتح لي ابواب رحمتك »(٥٩) واتە : خوایە لەتاوانو گوناهم خۆش بە وەبکەرەوە بۆمن دەرگای ڕەحمو بەزەییت ، وەکاتی چوونە دەرەوە لەمزگەوت سوننەتە ئەم پاڕانەوەیە بخوێنرێت :

« اللَّهم اني اسالك من فضلك »(٦٠) واتە : ئەی خوایە داوای بەخشیش و بەزەیی و لێبووردن لەتۆ ئەکەم

٥٨ ـ سورة الجن آية ـ ١٨ ـ

٥٩ ـ ، ـ٦٠ـ رواه النسائي •

هەروەکو ووتمان سوننەتە کە دوو ڕکات نوێژ بکـەین لە مزگەوتدا پێش ئەوەی دانیشین چونکە پێغەمبەر ـ صلی الله علیەوسلم ـ فەرموویەتی: « إذا دَخَلَ أحَدَکم المسجد فلیرکع رکعتین قبل ان یجلس »(٦١) واتە: هەرکاتێك یەکێك لەئێوە ڕۆیشتە مزگەوتەوە دوو ڕکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دانیشێ ٠

مزگەوت جێگای بەندایەتی خوایە بەهیچ جۆرێك ڕەوا نی‌یە بێجگە لەبەندایەتی‌و یادی خواو فێربوونی زانیاری زیاتر هیچی تری تێدا بکرێت بەتایبەتی دەنگ بـەرز کردنـەوە بۆدۆزینەوەی شتێکی وون بوو وەکو ئێستا باوە کەمزگەوتەکان بوون بە شوێنی جاڕدان٠ پێغەمبەر ـ صلی الله علیە وسلم ـ فەرموویەتی : « مَنْ سَمِعَ رَجُلاً یَنْشُدُ ضـالّةً فی المَسجد فَلْیَقُلْ لا رَدَّها الله عَلیك فانّ المساجِدَ لم تُبن لهذا »(٦٢) واتە : هەر کاتێك هەرکەسێك بیستی لەپیاوێك جاڕی دۆزینەوەی شتێکی وون بووی‌دا ، پێی بڵێن خوا نەتداتەوە مزگـەوتان بۆ جاڕدان دروست نەکراون ٠ هەروەکو مزگـەوتان مەڵبـەندی کۆبوونەوەی موسڵمانانـەو جێگای لێ قەوماوانو غەریبانە وەڕێك خەری‌کۆچ کـەرانو مـاڵ ئاوایی کـەرانە بۆ بـاوەشی گۆڕی تەنگ‌و تـاریك هـەروەهایش قوتابخانـەی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامـادەیی‌و زانکۆیـە بۆمنـاڵانی موسڵمان بۆ پێ گەیشتنیان لە هەموو ڕوویەکەوە ، هەرچی زاناو خاوەن بیرو خاوەن پلەو پایە هەیە کـە لاپەڕەی مێژوویان پێ ڕەنگین بووە هـەموویان دەرچووی مزگەوت بوون بەهەزارەها زاناو فەیلەسوفـو ئـەدیب‌و هۆنەر «شاعر» کەجیهانیان ڕازاندۆتـەوە قوتابی مزگـەوت بوون ژیـانی هـەرشاعیرو نووسەرێکی کورد ئەخوێنیتەوە لەپێشەوە نووسراوە لـەفلان مزگـەوت خوێندویەتی‌و فەقێ‌بووەو فلان مەلا دەرسی پێ ووتووەو مامۆستای بووە ٠

---

٦١ ـ رواه البخاري ٠

٦٢ ـ رواه المسلم ٠

... من بعض حجره فدخل المسجد فاذا هو

بحلقتين : احداهما يقرأون القرآن ويدعون الله ، والأخرى يتعلّمون ويُعَلّمون فقال النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ كل على خير وهؤلاء يقرأون القرآن ويدعون الله فان شاء اعطاهم وإن شاء منعهم ، وهؤلاء يتعلّمون ويُعلّمون وانما بعثتُ معلماً فجلس معهم »(٦٣) واته : ڕۆژێك لەڕۆژان پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەماڵەوە تەشریفی برد بۆ مزگەوت کە سەیری کرد دوو کۆمەڵ دانیشتوون لەمزگەوتدا کۆمەڵێکیان قورئان ئەخوێننو ئەپاڕێنەوە لەخوا ، کۆمەڵەکەی تریان فێرکەری فێرخوازان بوون ، پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی هەردوو لایان لە سەرچاکەن ئەوانەیان کەقورئان ئەخوێنن و ئەپاڕێنەوە لە خوا ئەگەر خوا ئارەزووی لێبێت لێیان وەرئەگرێت وەئەگەر ئارەزووشی لێبێت لێیان وەرناگرێت و هیچ سوودێك ناکەن بەڵام کۆمەڵی دووەم خەریکی فێرکردنو فێربوونی زانیارین ، من ڕەوانە ئەکراوم بۆ مامۆستایەتی ئەبێت لەگەڵ کۆمەڵی دووەمدا دانیشت ٠

٢ ـ نوێژی سوننەتی چێشتەنگا « سنة الضُحى » :

نوێژی چێشتەنگا بەندایەتی‌یەکی سوننەتە بەر ڕەوشتە گەورەکانی پێشەوای ئیسلام ئەکەوێت ٠

ـ ئەبو سەعیدی خودری فەرموویەتی :

« كانَ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ يُصَلّي الضحى حتى نقول لا يدعها ويدعها حتى نقول لا يصليها »(٦٤) واتە : پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ نوێژی چێشتەنگای ئەکرد وامان گومان ئەکرد کەتەرکی

---

٦٣ ـ رواه ابن ماجة ٠
٦٤ ـ رواه الترمذي ٠

ناکات وەجاری واش هەبوو ئـەی ئەگرد گومانمان والـەبرد کەتـەرکی ئەکات‌و ئیتر نایکات ٠

کاتی نوێژی سوننەتی چێشتەنگا لەکاتێکدا دەست پێ ئەکات ڕۆژ بەتەواوی هەڵبێت هەتا کاتی نیوەڕۆ لای کەمی ئەم نوێژە دووڕکاتە وەلای زووروری هەشت ڕکاتە چونکە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ چوار ڕکاتی کردوە جاری واش بووە هەشت ڕکاتی کردوە ٠ ئەبی هورەیرە فەرموویەتی : « أوصاني خليلي ـ صلى الله عليـه وسلم ـ بثلاث : صيام ثلاثة ايام في كل شهر ، وركعتي الضحى وان اوتر قبل ان أنام » ـ متفق عليه ـ واتە : پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلى الله عليه وسلم ـ سێ شتی پێ ڕاگەیاندوم : ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژی هەموو مـانگێك کـەڕۆژانی ـ١٣ ـ١٤ ـ١٥ مانگی عەرەبییە ٠ کردنی دووڕکات نوێژی چێشتەنگاو ٠ سوننەتی وەتر پێش ئەوەی بخەوم ٠

# نوێژ کردن بە کۆمەڵ «الجماعة»

بێ گومان کۆبوونەوەی ئادەمیزاد لەسەر کردارێك شێوەی کۆمەڵ ئەگورێت بۆیە لـە ئایینی ئیسلامدا فـەرمان دراوە بۆ موسڵمانان کـە نوێژەکانیان بەکۆمەڵ بـەجێ بهێنن ٠ کەڵکەکانی نوێژکردن بەکۆمـەڵ زۆرن ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن :

١ ـ نواندنی یەکسانی‌یە بۆ هەموو چینەکانی کۆمـەڵ بـەتێکرایی وبەرامبەر یەك پەروەردگار ئەوەستن بەبێ جیاوازی ٠

٢ ـ چاو پێکەوتن‌و بەسەرکردنـەوەی مووسڵمانان وەئاگاداربوون لەهەموو کەم‌و کوڕی‌یەك‌و تەنگ‌و چەڵەمەیەکی یەکتری ٠

٣ ـ قەلاچۆ کردنی هـەموو جۆرە نـەخۆشی‌یەکی دەروونی لـەدڵی موسڵماناندا بەوەی کـە هەژارو دەوڵەمەند ، پاشـاو کرێکار ، بچـووك وگەورە وەکو یەك لەریزێکدا ئەوەستن بەبێ ئەوەی هیچ یـەکێ لـەمانە هەست بەکەمی یەك بکات ٠

٤ ـ بێ شێل کردنی جینـایەتی ورەگـەز پـەرستی هەرکەسێك ئامادەی نوێژی جەماعەت بێت مالی چوونە ئاو ریزی کۆمەڵی ئەدرێتێ لە هەرنەتەوەیەك بێت هەرزمانێکی هەبێت وە لە هەررەنگێ بێت گەورەبێ یان بچووك ٠ بۆیە سوننەتە لەدوای بەجێ هێنانی نوێژی جەماعەت تەوقە بکرێت هەتادەستی کرێکار لەگەڵ دەستی سەرۆکی وولاتدا بەریەك بکەون ئەمەش نیشانەی یەکسانی ودادپەروەری‌یە ٠

**نوێژی کۆمەڵ سێ بەشە :**

١ ـ نوێژی هەینی «الجمعة» : کردنی ئەم نوێژە بەکۆمەڵ فەرزی «عەین»واتە پێویستە لەسەر موسڵمانێکی پیـاو بـەجێی بهێنێ مـادام بیانوویـەکی رێ‌پێ دراوی «شەرعی» نەبێت وەکو نـەخۆشی یان ترس‌و بیمی دوژمن یان رەشە باو بەفرو بارانی زۆر ٠

٢ ـ جەماعەتی نوێژە فەرزەکان : ئەمە فەرزی «کیفایە» ، کە واتــە ئەگەر چەند کەسێ ئامادە بوون بۆ بەجێ هێنانی تاوان لەسەر ئەو کەسانە نامێنێ کەئامادەی جەماعەتەکە نەبوون ٠

٣ ـ جەماعەتی نوێژە سوننەتــەکان : وەکو نوێژی جــەژنــەکانو نوێژەبارانــەو نوێژی ڕۆژ گــیرانو مــانگ‌گــیران ونوێژی تــەراویــحو نوێژیمردوو ٠ بەجێ هێنانی ئەمنوێژانە بەکۆمەڵ سوننەتێکی گەورەیە ٠

# پلەو ڕێزی نوێژێك کەبەکۆمەڵ بکرێت

« عن ابن عمر ـ رضي الله عنهما ـ ان رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ قال : صلاةُ الجمــاعة أفضل مِن صلاة الفَذّ بِسَبع وعشرين درجة »(٦٥) واتە : لە کوڕی حەزرەتی عومەرەوە ـ خوایان لێ ڕازی بێتـ گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی نوێژێك کە بەکۆمەڵ بکرێت باشترە وخێری زیاترە لە نوێژێك کە بە تەنها بکرێت بەبیستو حەوت پلە «درجة» نوێژی جەماعەت لە مزگەوتدا بکرێت خێری زۆرترە وەك لەدەرەوەی مزگەوت وە هەتا نوێژەکە قەڵەبالغی زۆر تربێ خێری زیاترە ٠ پیرۆزترین نوێژی جەماعەت ئەوەیە کەنوێژکەر بکات بــە «الله اکبر»ی نوێژدا بــە ستنندا لــەگــەڵ پێش نوێژ «إمام» ٠ وەخێری جەماعەتی دەست گیردەبێت کەسێك ئامادەی نوێژی جەماعەت بێت مادام پێش نوێژ سەلامی نەدابێتەوە ، واتە هەتاپێش سەلام دانەوەی پێش نوێژ هەردروستە نوێژکەر نیەتی نوێژی جەماعەت بهێنیت بێ‌گومان پێویستە بۆ ئەوکەسانەی کەلەدوای پێش نوێژەوە نوێژ ئەکــەن نیــەتی نوێژەکەیان بەنیەتی نوێژی جەماعەت بهێنن ٠

نوێژی هەینیو نوێژی جەماعەت بۆئافرەت سوننەتە بەمەرجێك بێ شەرعی تیاڕوو نــەدات وەدروستە کۆمــەڵێك ئافرەت ئافرەتێك بکــەن بەپێش نوێژ «ئیمام» بۆخۆیان ٠

---

٦٥ ـ رواه البخاري ومسلم ٠

# مەرجەکانی پێش نوێژ « ئیمام »

١ ـ پێویستە پێش نوێژ خوێنەوار بێت بەجۆرێك شارەزابێت لەفەرزو سوننەتی نوێژ ئەگەر لەکۆمەڵدا چەند کەسێکی تیابوو زانیاریان وەکو یەك بوو لەفەرزو سوننەتی نوێژدا ئەوا ئەوەیان پێش ئەخرێت کە شارەزای قورئانو فەرموودەی پێغەمبەرە ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەکوڕی ـ عەباسەوە ـ ڕەزای خوایان لێبێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : « إجْعَلُوا أئمتكم خِيار كُم فانَهُمْ وفدكم بينكم وبَيْنَ ربِّكُمْ » واتە : بڕیاربدەن کە پێشەوای نوێژەکانتان چاکە کانتان بن : «إنَّ أكرَمَكُم عِنْدَ اللهِ أتقاكُمْ »چونکە پێشەوایانی نوێژ ڕێکا پیشاندەرتانن لەو شتەی کە لە نێوانی ئێوەو پەروەردگارتانایە •

٢ ـ سوننەتە کاتێك پێش نوێژ لەبەردەم نوێژ کەرەکاندا ئەوەستێ لەدوای قامەت کردن بەلای ڕاستدا لایکاتەوەوە بەلای چەپیشا ئینجا بڵێ «أقيموا صفوفكم وتراصوا» چونکە : « عن أنس ـ رضي الله عنه ـ قال: اقيمت الصلاة فأقبل علينا رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ توجهه فقال : اقيموا صفوفكم وتراصوا فاني أراكم من وراء ظهري »(٦٦) واتە : ئەنس ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ فەرموویەتی کاتی بەجێ هێنانی نوێژ بوو ، پێغەمبەری خوا ڕووی کردە ئێمە فەرمووی ڕێكو پێك بکەن ڕیزەکانتان «صەفە کانتان» وەپاڵ بدەن بەیەکەوە چونکە بەڕاستی من ئێوە ئەبینم لەدوای خۆمەوە •کەوا تە لێرەدا پێش نوێژ ئەبێ بڵێت «اقيموا صفوفكم وتراصوا » •

لەم فەرموودەیەی پێغەمبەرەوە بۆمان دەر ئەکەوێت پێویستە پێش نوێژ بایەخ بدات بەڕێكو پێکی ڕیزەکانی جەماعەت وە هەروەها

---

٦٦ ـ رواه البخاري •

موعجیزەیەکی پێغەمبەر پشمان بۆ دەرئەکەوێت کـە لە پشتی خۆیـەوە خەڵکی بینیوە ئەمەش یەکێکە لەبەخشیشەکانی خوا کەداویەتی بەپێشەوای هەردوو جیهان ٠

٣ ـ سوننەتە پێش نوێژ زۆر درێژەنەدات بەنوێژی جەماعـەت ٠ لەئەبی هورەیرەوە ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : « إذا صلّى أحدُكم فَلْيُخفّفْ فانَّ فيهم الضّعيفَ والسَّقيمَ والكبيرَ وذا الحاجةِ وإذا صلّى أحدُكم لِنَفْسهِ فَلْيُطَوِّل ما شاء » ٠ واتە : هەرکاتێك یـەکێ لـەئێوە بوو بـەپێش نوێژی موسڵمانان بازۆر درێژە نـەدات بەنوێژەکەی چونکە لەناو ڕیزی ئەو موسڵمانانەدا پەك کەوتوو ونەخۆش‌و پیرو تەنگاوی تیایە ،هەرکاتێك یەکێك لەئێوە نوێژی بۆخۆی کرد واتـە پێش نوێژ نەبوو بـە ئارەزووی خۆی درێژەی پێ بدات ٠

٤ ـ پێش نوێژ لـەنوێژی ئێوارەو بـەیانی‌و خەوتنـانەدا پێویستە سورەتی فاتیحەو ئەو سورەتەی لـەدوای فاتیحـە ئەیخوێنێ بـەدەنگی بەرزەوە بیخوێنێ وە ئەوانەی لەدوای ئیمامەوە وەستاون بێ دەنگ ئەبن هەتا ئیمام لەخوێندنی فاتیحـە ئەبێتەوە ، کاتێك ئیمام ووتی ـ آمین ـ ئەوانەی کە لەدوای ئیمامەوەن «مەئمومەکان» بەیەك ٠ دەنگ ئـەوانیش ئەڵێن ـ آمین ـ ئینجا دوای ئەوە ئەوانیش سـورەتی فاتیحـە بۆخۆیان ئەخوێنن ٠ لەئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کەپێغەمبەر ـ صلى الله عليـه وسلم ـ فەرموویەتی : « إذا أمَّنَ الامام فأمنوا فانَّهُ مَنْ وافَقَ تأمينُهُ تأمينَ الملائكة غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ مِن ذنبـه ، وقال ابن شـهاب وكان رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ يقول ـ آمين »(٦٧) ٠ واتە : هەرکاتێك پێش نوێژ ـ ئامین ـ ی کرد ئێوەش ـ ئامین ـ بکەن هەرکەسێك ـئامین ـ

٦٧ ـ رواه البخاري ٠

کردنی لەنوێژدا بەرامبەر بێ لەگەڵ ئامین کردنی فریشتەکان خوای گەورە لەتاوانە بچووکەکانی ڕابوردوی خۆش ئەبێت • چونکە فریشتەکانی خوا لەگەڵ ئامین کردنی کۆمەڵی نوێژ کەراندا ئامین ئەکەن •ـ ئیبن شەهابـ ئەفەرموێت پێغامبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەدوای تەواوبوونی سورەتی فاتیحە ئەیفەرموو ـ آمینَ ـ بەمەددە ـ واتە پیتی «ئەلف»و «یا»ی ووشەی ـ ئامین ـی درێژ ئەکردەوە •

پێش نوێژ کاتێك کە لەدووڕکاتی یەکـەمدا لەنوێژەکانی ئێوارەو خەوتنانو بەیانیان لە دوای سورەتی فاتیحـە وە کـە دەستی کرد بـە خوێندنی سورەتێك لە سورەتەکانی قورئان یان چـەند ئایەتێك ئـەبێ ـ مەئمومەکان ـ بێ دەنگ بن وگوێ بگرن بۆ پێش نوێژ لەدوای لـێ بوونەوەیان لەسورەتی فاتیحە •

٥ ـ پێویستە لەسەر پێش نوێژلـەکاتی نیوەڕۆو عـەسردا دەنگ بەرز ئەکاتەوە ، وەهەریەکە لـەپێش نوێژو مەئموومەکان بۆیان هـەیەو سوننەتە لەدووڕکاتی یەکەمدا لەدوای خوێندنی سورەتی فاتیحە سورەتێکی کورت بخوێنن ، بەڵام لەدووڕکاتی سێهەمو چوارەمدا نابێ هیچ بخوێنن چ پێش نوێژو چ مەئموومەکان •

هەموو مەرجـەکانی نوێژی کۆمـەڵ وەکو نوێژی تاکوان بـەڵام هەرئەوەندە هەیە ئەبێ مەئموومەکان شوێن کەوتووی پێش نوێژبن لەکاتی «رکوع وسجود» وهـەڵسانو دانیشتندا ئـەگـەر بـە ئارەزووی خـۆی سەرپێچی پێش نوێژی کرد لەنوێژەکەیدا واتـە پێش ئیمـام بکـەوێت نوێژەکەی بەتاڵەو دانامەزرێ • هەر وەکو ئەبی هورەیرە ـ رەزای خوای لێ بێ ـ ئەفەرمووێ : پێغەمبەر ـ صلی الله علیـە وسلم ـ فەرموویەتی : « أمَا یخشی احدُکـم إذا رَفَعَ رأسَهُ قبـلَ الامـام انْ یَجْعَلَ اللهُ رأسَهُ رأسَ حِمارٍ او یَجْعَلَ اللهُ صُورَتَهُ صورة حِمارٍ » ـ رواه

البخاري ــ واته : ئایا ناترسێ یەکێ لەئێوه ؟ یا بۆچی ناترسێ یـەکێ لەئێوه ؟ هەر کاتێك پێش ئیمام لەنوێژدا سەری بەرزبکاتەوه خوای گەوره سەری بگۆڕێ بـەسەری گوێ درێژ ، یاشێوەی بەرێتـە شێوەی گوێ درێژەوه ٠

هەر وەکو لەوەوپێش باسی ــ قنوت ــ مان کرد ووتمـان سوننەتـە لەنوێژی بەیانیدا بخوێنرێت ٠ ئەگەر نوێژێك بە کۆمەڵ کراو قنوتی تیا خوێنرا پێویستە وەکو شێوەی کۆمەڵ بخوێنرێت واتە ئیمام بۆ هەموویانی بخوێنێت بۆ نموونە لەجیاتی ئەوەی بڵێت: « اللّهم اهدني فيمَن هَدَيت » ئەبێ بڵێت « اللهـم اهدِنا فيمَن هَدَيت »وە هەروەهـا ٠٠٠ لـەکاتی خوێندنی قنوتدا هەتا ئیمام ئەگاتە « وَقِنا شَرَّ ماقضَيت »مەئمومەکان تەنها ئەڵێن ــ ئامین ــ بەڵام لـەدوای ئەمە مەئموومەکانو ئیمام بۆخۆیان هەرچی یەکی ماوه لەقنوتەکە ئەیخوێنن ٠

بێگومان ئەگەر قنوتیش نەخوێنرێت نوێژ بەتاڵ نابێتەوه چونکـــە فەرز نی یە ، بەڵام ئەگەر خوێندنی قنوت لـەبیر چوو سوننەتـە سوجدەی لەبیر چوونی بۆ ببرێت ، سوجدەی لـە بیر چوون «سەهو» پێش سـەلام دانەوه ئەبرێت کاتێك تەحیات تەواو بوو سەلام نادرێتەوه هەتا دوو جار سەر نەخەیتە سەرزەوی بەنیازی بردنی سوجدەی سەهووەوه وە ئەڵێیت: « سُبْحانَ الّذي لا يَسهُو ولا يَنام » ٠

گـەورەترین شـێتك کـەبـەندایـەتی ڕاسـتەقینـە بنـوێنێـت بەرامبـەر بـەخوای گـەوره بریتی یەلـە کڕنووش بردن «سجدة» هـەر سوجدەیەك بێت ٠ چونکە لـەڕۆژی دواییدا هـەموو پارچـەکانی لەش ئاگری دۆزەخ ئەیان گرێتەوه بێجگە لەشوێنی سوجده ، واتـە ئـەگەر موسڵمانێك لەسەر تاوانەکانی خرایـە دۆزەخەوه هـەموو لـەشی ئاگر ئەیسووتێنێ بێجگە لەشوێنی سوجده ئەمـە لەیەکێ لـە فەرموودەکانی

پێغەمبەردا ـ صلى الله عليه وسلم ـ باس‌کراوە کە ـ بوخاری ـ بۆمانی ئەگێڕێتـەوە « عَنْ عائشة ـ رضي الله عنها ـ قالت : كانَ النبـي ـ صلى الله عليـه وسلم ـ يُكْثِرُ أنْ يقـولَ في رُكُوعِهِ وسُجودِهِ سُبْحانَكَ اللّهُمَّ رَبَّنا وَبِحَمْدِكَ اللّهم اغفر لي ـ يتأوّل القُرآن » واتە : لەدایکی موسڵمانانەوە حەزرەتی ـ عایشە ـ ڕەزای خوای لێ‌بێ ـ گێڕراوەتەوە لـە پێغەمبەر ـ صلى الله عليـه وسلم ـ زۆری ئەفـەرموو لەڕکوعو سوجدەکاندا پاکو خاوێنی بۆ تۆیە ئەی خوایە ، پەروەردگارمان سوپاس‌و ستایش بۆتۆ ، خوایـە لێم خۆش‌بی ـ وە لـە پاڕانەوەکەیدا لەسەر شێوەی ئایەتێکی قورئانی ئەپاڕایەوە کە خوا فەرمانی پێدا بوو ٠ « فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ واسْتَغْفِره » ٠

لەسەلام دانەوەی نوێژی جەماعەتدا پێویستە مەئمومەکان چاوەڕێی ئیمام بکـەن هـەتا سـەلامی لای ڕاسـت ئـەداتەوە ئینجا کاتێ دەنگی بەرزکردەوە بۆسەلام دانەوەی لای چەپ مـەئمومە کانیش سەلامی لای ڕاست ئەدەنەوە ئینجا سەلامی لای چـەپیش ٠ وە هەروەکو لـەوەپێش باس‌کراوە ئەبێ بوو ترێت « السّلام عليكم ورحمة الله وبركاته » وەکو وتمان لەسەلام دانەوەدا ئـەبێ ئـەوەندە لابکەیتـەوە هەتا سەرشانو کولمی خۆی ئەبینێ ٠

هەندێ کەس هەیە لەدوای سـەلام دانـەوەی لای ڕاست سـەری دائەنەوێنێ ئینجا سەلامی لای‌چەپ ئەداتەوە ئەم شێوەیە ئایینی ئیسلام فەرمانی نەداوە بەکردنی وەکردەوەیەکی بەتاڵو بێ هوودەیە ٠

# نوێژی هەینی « صلاة الجمعة »

ئایینی ئیسلام ئایینێکی کۆمەڵایەتی پیرۆزە هەمووکاتێك موسڵمانان هان ئەدات بۆ کۆبوونەوەیان وەبانگەوازیان لێ ئەکات بۆ بەجێ هێنانی ئەرکی سەر شانیـــان ، وە ئایینی ئیسلام دژی دووبەرەکیو جیاوازی یەبۆیە هەمیشە موسڵمانان بانگ ئـەکات بۆ بـەندایەتی خوا لـەژێر سێبەری برایەتیو یەکسانیو دادپەروەریدا ٠

ڕۆژی هەینی دیاری کراوە بۆ بەدەست هێنـانی ئـەو مـەبەستە پیرۆزانە وە ڕۆژی هەینی گەورەترین ڕۆژە لەڕۆژانی ژیانی ئادەمیزاددا وە نوێژێکی تایبەتی بۆ ئەو ڕۆژە دیاری کراوە کەخوای گەورە موسڵمانانی بۆ بانگ ئەکاتو ئەفەرموێت : « یـا أیُّها الَّذینَ آمَنُوا إذا نُودِيَ لِلصَّلاةِ من یومِ الجُمُعةِ فاسْعَوا الی ذِکْرِ الله وَذَرُوا البَیعَ ذالِکُمْ خیرٌ لَکُمْ إنْ کُنْتُمْ تَعْلَمُون ٠ فاذا قُضِیَتِ الصَّلاةُ فانْتَشِروا في الأرضِ وابتَغوا مِنْ فَضْـلِ اللهِ واذکُرُوا اللهَ کَثیراً لَعَلَّکُمْ تُفْلِحُون »(٦٨) واتە : ئـەی ئەوکەسانەی خـاوەن باوەڕن هـەرکاتێك بانگەواز کرا بۆ نوێژی هەینی لەڕۆژی هەینیدا بەخێرایی و بـەگورجی پێشوازی بانگەوازەکەی خوا بکەن بڕۆن بۆ بەجێ هێنانی فەرزی نوێژی هـەینی ، واز لـەکڕینو فرۆشتن بهێنن ٠ ڕۆیشتن بۆ نوێژی هـەینی سوودو قازانجـی زیاترە بۆتان لـەوەی کـە خۆتان خـەریك بکەن بـە ئارەزووەکانی دونیاوە ئەگەر ئێوە خاوەنی بیرو زانستێکی بەسوودن ٠ لە دوای بەجێ هێنانی نوێژی هەینی بڵاوەی لێ بکەن بەسەرزەویدا هـەوڵی کارو فەرمانی خۆتان بدەن گۆششی ڕۆژی بکەن بەیارمەتی خوا ، وە بیرو یادی خوا بکـەن بەزۆری بـەهیوای ئەوەوە کـە لـەسزای پاشـەڕۆژ ڕزگاربن نوێژی هـەینی لـەسـەر هـەموو خاوەن باوەڕێکی نێرینـەی

٦٨ ـ سورة الجمعة ـ آیة ـ ٨ ـ ١١ ـ

پێکەیشتوو «بالغ»ی خاوەن ژیری «عاقل» ئازادی نیشتەجێ کەنەخۆشی‌و بیانووی شەرعی نەبێت فەرزی «عەینە» پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ نوێژی هەینی کردوە بە بەردەوامی لەسەرەتای فـەرز بوو نیـەوە هـەتا کۆچی دوایی کردوە ، لە ئایینی ئیسلامدا ڕێ‌نەدراوە بۆ بەجێ نەهێنانی نوێژی هەینی بە ئارەزوو • پێغەمبەری خوا لە فەرموودەیەکیدا ئەفەرمووی: « مَنْ تَرَكَ ثَلاثَ جُمَعٍ تَهاوُناً طَبَعَ اللهُ عَلى قَلْبِهِ » واتە : هەرکەسێك بەجێ نەهێنێ سێ‌نوێژی هەینی بەئارەزوو هیچ بیانوویەکی شەرعی نـەبێت خوایگـەورە مۆری تاوان باری ئـەدا بـەسـەر دڵیدا ـ پەنابەخوا ـ •

نوێژی هەینی پێنج مەرجی تری هەیە جگە لەمەرجەکانی نوێژ :

١ ـ کاتەکەی نیوەڕۆیە • ئەگەر نوێژی هـەینی لـەکاتی نیوەڕۆ تێپەڕی کرد بە قەزا ناگێڕرێتەوە ئەبێ نوێژی نیوەڕۆ بگێڕرێتەوە •

٢ ـ ئەبێ نوێژەکە لـەناو شاردا یان لـەناو دێدا بکـرێت نـەك لەدەشت‌و دەرەوەی شارەکەیان دێ‌کە •

٣ ـ ئەبێ نوێژەکە پێش نەکەوێ وبەرانبەری نەکات لەگەڵ نوێژێکی تردا لەو جێگەیەدا واتە ئەبێ لەشارێکدا یان لەدێ‌یەکدا یەك نوێژی هەینی بکرێت مەگەر شارەکە گەورەبێت‌و خەڵکی دانیشتووانی شارەکە زۆربن‌و جێگایان نەبێتەوە ئەوکاتە درووستە لـەدوو مزگەوتدا یان زیاتر نوێژی هەینی بکرێت •

٤ ـ ئەبێ نوێژی هەینی بەکۆمەڵ بکرێت وەمەرجی نوێژی جەماعەتی هەینیی وەك جەماعەتی نوێژەکانی تروایە وەنوێژی هـەینی دوورکاتـە بەڵام جەماعەتی نوێژی هەینی ئەبێ ئەندامەکانی لەچل کەس کەمتر نەبن وەئەو چل‌کەسەش پیاوبن ، سوننەتە ئافرەتیش نوێژی هەینی بکات بەڵام ژمارەی ئەندامەکانی نوێژی هەینی پێ تەواونابێ •

٥ ـ خوێندنەوەی دوو ووتار «خطبتان» لەپێش نوێژەکەدا ٠

پایەکانو پێك هاتووەکانی ئەو دوو وتارە پێنجن :

١ ـ سوپاسو ستاییشی خوا وەکو « الحمد لله » ٠

٢ ـ سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر وەکو « والصلاة والسلام على رسول الله » ٠

٣ ـ ئامۆژگاری «الوَصيَّة» «اوصيكم بتقوى الله» ٠

٤ ـ خوێندنی ئایەتێك لەیەکێ لەو وتارەکاندا وەکو : « مَنْ عَمِلَ صالِحاً فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أساءَ فَعَلَيها وما رَبُّكَ بِظَلاّمٍ لِلعَبيدِ »(٦٩) ـ سورەتی فصلت ـ(١)

٥ ـ نزاو پاڕانەوە بۆ موسڵمانان لەووتاری دووەمدا ٠

پێویستە ئەو کەسانەی کە دانیشتوون گوێ لەهەردوو ووتارەکە بگرن با ووتارەکەش بەزمانی عەرەبی بێتو لێی تێنەگەن ٠ وەنابێ لەکاتی ووتارەکاندا هیچ نوێژێك بکرێت مەگەر کەسێك لەکاتی ووتارەکاندا بڕواتە ژووری مزگەوتەوە بۆنوێژی هەینی ئەوکاتە دروستە دوورکات نوێژی مزگەوت «تحیة المسجد» بکات ٠ وەدروست نی یە بۆئەو کەسانەی کەئامادەی نوێژی هەینی ئەبن لەکاتی ووتارە کوردی یەکەدا گوێ ئەگرنو لەکاتی ووتارە عەرەبی یەکەدا هەڵ ئەستنەوە نوێژ ئەکەن، ئەگەر کەسێك درەنگ فریای نوێژی هەینی کەوت بەجۆرێك کەپێش نوێژ ڕکاتێکی نوێژی هەینی کردبوو ئەو کەسەش لەڕکاتی دووەمدا نیەت ئەهێنێو لەپاش سەلام دانەوەی پێش نوێژ هەڵ ئەسێتەوە ڕکاتەکەی

---

١ ـ هەرکەسێك هەرکارێکی باش بکات بۆخۆی ئەبێت وەچا کەو پاداشتیشی هەر بۆخۆی ئەبێ وەهەر کەسێ هەر کارێکی خراپو ناڕەوا بکات هەر بۆخۆی ئەبێت وەسزاو تۆڵەشی هەر بۆخۆی ئەبێت وەپەروەردگاری تۆش ستەمکار نی یە بۆ بەندەکانی ٠

تری تەواو ئەکات . ئەگەر کەسێك لـەکاتی خوێندنی تـەحیاتدا یـان سوجدەکاندا گەیشت بەپێش نوێژ ئەبێ نیەتی نوێژی هەینی بێنێت وە لەپاش سـەلام دانـەوەی پێش نوێژ چواررکات نوێژی نیوەڕۆ ئـەکات بەنیەتی نوێژی هەینی یەکەوە .

صَلَّیْـتُ لا نَـوَیْـتُ ـ نَـوَیْـتُ لا صَلَّیْـتُ

نوێژم کردو نیەتم نەهێنا ـ نیـەتم هێنـاو نوێژم نـەکرد

# نوێژی جەژنەکان

نوێژی جەژنەکان سوننەتێکی گـەورەیـەو خێرێکی زۆری تێدایـە وەبەلای هەندێ لە زانایانی ئیسلامەوە فەرزی «کیفایە»ن وە سوننەتە ئەم نوێژانە بەکۆمەڵ بکرێن ، نوێژی جەژن دروستە بۆ تەنهاو بەندە و ژن و ڕێبوار . وەکاتی نوێژی جەژن لەگەڵ هاتنی خۆرەوە دەست پێ ئەکات هەتا خۆر لەناوەڕاستی ئاسمانەوە تێپەڕ ئەکات . وەنوێژی جەژن سوننەتـە دوابخرێت هەتا خۆر بەئەندازەی ڕمێك بەرز ئەبێتەوە . نوێژی جەژن دوو ڕکاتە نیەتی نوێژی جەژنی ڕەمەزان یاقوربانی بۆ ئەهێنرێت وەلـەدوای ـ الله أکبر ـی نوێژدا بەستن پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە لـەڕکاتی یەکەمدا حەوت جار ـ الله اکبرـ ئەکرێت وەلەنێوان هەموو ـالله اکبرـێکدا ئەمە ئەخوێنرێتی « سبحان الله والحمد لله ولا إلـه إلا الله والله اکبـر » وەلەگەڵ هەموو ـ الله اکبر ـ ێکدا دەست بەرز ئەکرێتەوە هـەتا ئاستی شان ، بەڵام لەڕکاتی دووەمدا پێنج جار ـ الله اکبر ـ ئەکرێت هەروەکو ڕکاتی یـەکـەم « سبحان الله والحمد لله ولا إلـه إلا الله والله اکبـر » ئەخوێنرێتو هەردوو دەست بەرز ئەکرێتەوە . دوای نوێژەکە ووتار خوێن «خطیب» دوو ووتار ئەخوێنێتەوە بۆگوێگران هەروەکو نوێژی هەینی .

سوننەتە ـ الله اکبر ـ بکرێت لەشەوەکانی جەژندا بۆ جەژنی ڕەمەزان دوای ئاوا بوونی خۆر شەوی جەژن «الله اکبر» ئەکرێت هەتا نوێژی بەیانی ئەکرێت ئیتر کۆتایی پێ ئەهێنرێت ·

بۆ جەژنی قوربان لە بەیانی ڕۆژی عارەفەوە دەست ئەکرێت بەووتنی ـ الله اکبر ـ هەتا سێ‌ڕۆژ دوای جەژن لەکاتی ڕۆژ ئاوابوون لەڕۆژی سێ‌یەمی جەژندا کۆتایی پێ ئەهێنرێت وە بە هەموو یەوە ئەکاتە پێنج ڕۆژ ·

وە شێوەی ووتنەکەش بۆهەردوو جەژنەکە بەم جۆرەیە :

سێ‌جار

« الله اکبر ـ الله اکبر ـ الله اکبر ـ وەیەك جار ـ لا إله إلا الله الله اکبر الله اکبر ولله الحمد ـ » ·

# نوێژی ڕۆژ گیرانو مانگ گیران

ئەم نوێژانە سوننەتن هەرکاتێ خۆر یان مانگ بگیرێن ، وەنیەتی نوێژی مانگ‌گیرانو ڕۆژگیرانی بۆ ئەهێنرێت وەلەپاش نوێژ دابەستن سورەتی فاتیحە دەخوێنرێت ئینجا ئەچێتە ڕکوع وەلەپاشان کە هەڵسایەوە لەڕکوع دووبارە سورەتی فاتیحە ئەخوێنرێت ئینجا ئەچێتەوە ڕکوعو لەپاشان هەڵ‌ئەسێتەوە لەڕکوع سوجدە دەبرێت ئەمە ڕکاتی یەکەم‌بوو ڕکاتی دووەمیش هەربەم جۆرە دەکرێت ،وەسوننەتە ئەم نوێژانە بەکۆمەڵ بکرێن بۆ مانگ گیران پێش نوێژ دەنگ بەرز ئەکاتەوە بەڵام بۆنوێژی خۆرگیران پێش‌نوێژ پێویستەدەنگ بەرز نەکاتەوە · وەپاش تەواوبوونی نوێژەکان پێش‌نوێژ دوو ووتار ئەخوێنێتەوە وەکو ووتارەکانی نوێژی هەینی ·

# نوێژە بارانە

نوێژە بارانە سوننەتە لەکاتی پێویستیدا ئەگەرباران نەباری ئـەم نوێژە دووبارەو سێبارە بکرێتـەوە ٠ بۆ ئـەم نوێژە ئـەبێ پێش نوێژ فەرمان بدا بەخەڵککە کـەوا سێ ڕۆژ بـە ڕۆژووبن لەسەرەتادا وە بۆ ڕۆژی چوارەم ئەچنە دەرەوە بۆنوێژەکـە تەوبە بکەن لـە گوناهو تاوان وەچاکەو خەیر بکەن وەمافی «حق»مافداران بدەنەوە ، وەدڵیان بەرامبەر یەکتری پاكبکـەنەوە ، وەکاتێ ڕۆیشتن بۆنوێژەکـە بڕۆنـە دەرەوەی شارەکەیان یادێکەیان وەشێوەی ڕۆیشتنـە کـەیان بـەکزی ولارەملی بەوەبێت وەبەبەرگێکی کۆنودڕاوەوە ٠ مناڵ وپیرو لێقەوماوو هـەروەها ئاژەڵیش لەگەڵ خۆیان ببەن ٠

حەزرەتی ـ عومەر ـ ڕەزای خوای لێبێ ـ ئەمنوێژەی بەجێ هێنا ساڵێك لـەدوای کۆچی دوایی پێغەمبـەر ـ صلى الله عليـه وسـلم ـ حەزرەتی ـ عومەر ـ پاڕایەوە لەخوای گەورە فەرمووی خوایە ساڵی پار بێ بارانیبوو لەبەرخاتری پێغەمبـەر بارانت بۆباراندین ئـەم ساڵێش لەبەرخاتری ـ عـەبباسی ـ مامی پێغەمبەر ـ بارانمان بۆببارێنە خـوای بەبەزەیی نزاو پاڕانەوەکەی وەرگرتو بارانیان بۆباری ٠

نوێژە بارانە دوو ڕکاتە وەك نوێژی جەژنەکان دەکرێت لـەدوای بەجێ هێنانی نوێژەکە پێش نوێژ دوو ووتاریان بۆئەخوێنێتەوە لەووتاری دووەمدا ڕووئەکاتـە قیبلەو زۆر ئەپاڕێتەوە ، وەبەر ماڵەکەی ڕاسـتو چـەپ بـکات بیدا بەسـەر شـانیدا ، نوێژکەرەکانیش وەك پێش نوێژ بەرماڵەکەیان بگۆڕن هـەربـەو شێوەیـە بمێننەوە هەتا ئەگـەڕێنـەوە بۆشارەکەیان ٠

# نوێژی نەخۆش

هەر کاتێك کەسێك نەیتوانی نوێژ بەپێوە بکات لەبەر پیری یان نەخۆشی ، بۆی هەیە بەدانیشتنەوە نوێژ بکات بەگوێرەی توانای خۆی رکوع و سوجدەبەجێ بهێنێ . ئەگەر لەسەر تەنیشت نەیتوانی بەراکشانەوە وپاڵ کەوتن، دەتوانێ بیکات بەشێوەیێ هەردوو قاچی روویان بکاتە رووگە وەپاڵ کەوێت وەبەسەری ئیشارەت بکات بۆ رکوع وسوجدە . ئەگەر بەم شێوەیەش نەیتوانی بەدڵ و بەخەیاڵ بەجێی بهێنێ . رێزو گەورەیی نوێژ لەئایینی ئیسلامدا بەم شێوەیەیە بەهیچ جۆرێك رێگەنەدراوە بەنەکردنی .

# نوێژی مردوو

پێش ئەوەی بێینە سەرنوێژی مردوو بەپێویستی ئەزانین دەربارەی مردوو شتێك باس بکەین .

بۆهەموو کەسێك سوننەتە زۆر بیر لەمردن بکاتەوە ، وەخۆی بۆمردن ئامادە بکات بەتەوبەو گەرانەوە لەگوناهی وەهەر ستەم و زۆرداری یەکی کردوە بەرامبەر بە خەڵك داوای لێبووردنیان لێ بکات و مافی خۆیانیان بداتەوە ، وەیا گەردنی خۆیان پێ ئازاد بکات ، وەئەگەر کەسێك بێ فەرمانی خوای کردبوو بابگەرێتەوەو وازی لێ بهێنێ وەپەشیمان بێتەوە لەوکردەوە چەوتانەی کەکردوویەتی وەخۆی ئامادە بکات بۆخواپەرستی ، بەراستی ئەمانەی کەباسمان کردن بۆنەخۆش زۆرتر پێویستەو گرنگە بۆی چونکە لەمردنەوە نزیکە .

ئەگەر یەکێك لەمردن نزیك بووەوە سوننەتە بەلای راستیدا رابکێشرێ رووەو قیبلە وەئامۆژگاری بکرێت بەهێنانی شایەتمانو

هێنانی باوەڕ بەتەنیایی خوا واتە ووتنی « لا إله إلا الله » وەسوننەتە سورەتی یاسینی بەسەردا بخوێنرێت وەقسەی خۆشی بۆبکرێت هەرکاتێك گیانی دەرچوو هەردووچاوی لێك بنرێت وە چەناگەی هەڵ بەسترێت بۆئەوەی دەمی نەکرێتەوە وەئەندامەکانی لەشی ڕاکێشرێ‌و ڕێك وپێك بکرێن ئینجا بەشتێکی تەنك داپۆشرێت وەشتێکی قورس بخرێتە سەر سکی‌وە لەشوێنی شتنی دابنرێ ڕوو بەقیبلە لەدوای ئەوەپۆشاکی لێ‌دا ئەکەنرێ ‌•

ئەمانەی کەباس کران پێویستە لەسەر دڵسۆزترین کەسی مردووەکە هەڵسێ بەکردنیان بۆئەوەی ئەگەرمردووەکە کەم‌و کوڕی‌یەکی تێدابوو بێگانە پێ‌ی نەزانێ •

شتنی مردوو کفن‌کردنی‌و نوێژ لەسەرکردنی‌و بەخاك سپاردنی فەرزی «کیفایە»ن واتە هەندێك لەکۆمەڵی موسڵمانان یان‌موسڵمانێك ئەمانەی بەجێ هێنا فەرزەکە لەئەستۆی موسڵمانانی‌تر لائەچێت بەڵام ئەگەر کەس نەبوو هەڵسێ بەجێ بەجێ کردنی ئەمانە هەموو موسڵمانانی ئەودەورو بەرەتاوان بارئەبن •

# چۆنیەتی شتنی مردوو

پێویستە لەکاتی شتنی مردوودا هەرچی پیسی‌یەك بەلەشیەوە هەیە بەئاو لاببرێتەو بشۆررێت ، ئینجا هەموو لەشی مردووەکە تەڕبێ‌و ئاوی بەسەردا بێتەخوارەوە ، وەپێویست‌بەوە ناکات کەمردووشۆر بڵێت ـ نیەتمە ئەم مردووە ئەشۆم ـ بەڵام سوننەتە ئەگەر مردووەکە ئادەمیزادی بێ‌باوەڕ بیشوا نیەتی شتنی بۆ بهێنێت بێ گومان مردوو ئەگەر بەئاویش خنکا بێت هەرپێویستە بشۆرێت ، لەکاتی شتنی مردوودا جوانتر وایە ئەومردووە لەجێگەیەکی چۆڵدا دابنرێت

وەداپۆشرێت وەپێویستە تەنها مزدوو شۆرەکەو یارمـەتی دەری مردوو شۆرەکە لەلای بمێننەوە ، وەخەلکی تر دەوری چۆل بکەن ، ئینجا مردوو شۆرەکە دەستی چەپی چەند جارێك ئەهێنێت بەسەرسکی مردووەکە داو چەند جارێك دووبارەی بکاتەوە بۆ ئەوەی ئـەگـەر شتێك لەسکیدابێ بێتە دەرەوە ، ئینجا پاش‌و پێشی بەجوانی بشۆررێت وەمردوو شۆرەکە دەست کێش بکاتە دەستی پاش ئـەوەی کەپاش و پێشی مردووەکـەی خاوێن کردەوە دەسـت کێشەکـەی بگۆرێت ئینجـا دەم و لووتی پـاك بکاتەوە ، وەژێر نینۆکەکانی خـاوێن بکاتـەوە ئینجـا دەست نوێژی مردووەکە ئەشوات لەسەریەوە دەستپێبکات بـەشتنی ، وەسوننەتـە لای راستی پێش بخات ، ئەگەر پارچەیەك لەلەشی بووبێتەوە ئەبێ فرێ نەدرێـت وبخرێتـە وە ناو کفنەکـەی · وەئـەبێ مردوو شـۆرەکـە وەری‌گێرێ‌و بیخاتە سەرلای راستی‌و چەپی وەبەباشی هەموو ئەندامەکانی لەشی بشوات وەلە سەرەتای شتینەوە شتێکی بۆن خۆش بـەکاربهێنێ ئنجـا ئاوێکی پاك‌بکرێت بەسەر هـەموو لەشیدا وەسوننەتە سێ جـار ئاو بکات بەسەر لەشیدا ، ئەگەر لەدوای شتنی مردووەکـە هـەرشتێ لەپاش وپێشی‌یـەوە دەرچوو یاخوێن دەرچوو ئەبێ دووبارە مردووەکـە بشۆررێتەوە ، ئـەگـەر مردوویـەك برینداربوو خوێنی نەوەستایـەوە پێویستە هەوڵ‌بدرێت بۆبەستنی برینەکە بەهەر هۆیەك بێت ·

بێ‌گومان ئەبێ پیاوی مردوو پیاو بیشوات وەئافرەتیش هەرئافرەت بیشوات ، بەلام مێرد بۆی هەیە ژنەکەی خۆی بشوات بەمەرجێ دەست کێش بکاتە دەستی · ئەگەر پیاو یان ئافرەت کەسی «مەحرەم» نـەبوو بیان شوات نابێ پیاوی بێگانە «نامەحرەم» ئافرەت بشوات ، یائافرەتی بێگانە پیاو بشوات بـەلکو لەوکاتـەدا پێویستە تەیەمومیان بۆبکرێت مردوو ئەبێ خزمی خۆی بیشوات ئەوەی کەزۆر نزیکەلێ‌یەوە ·

# کفنی مردوو

باشترین کفن بۆپیاو سێ کفنه بـەڵام تاچوارو پێنجیش هـەر دروسته هەروەها بۆئافرەتیش چاکتروایه پێنج کفنی بۆ بکرێت ٠

بۆ پیاو و بۆ ئافرەت ئەگـەر سێ کفنیـان بۆ بکرێت ئەبێ هـەر سێکیان وەهابن هەر یەکەیان داپۆشەری لەشی مردووەکەبن ، ئەگـەر پیـاو پێنج کفنی بۆکرا بادوائیـان کراس ومێزەربن وەبۆ ئافـرەتیش دوائیان لە فافەبن واتە داپۆشەری هەموو لەشی وەسیائیشی دەرپێ بن کەلەناوکیەوە تا سەر ئەژنۆی بگرێ وەسەرپۆش وکراس بن وەسوننەتەبۆ مردوو کفنی سپی بۆ بکرێت وەپێویستە کفنی مردوو لەوماڵە بۆیبکرێت کەبەجێی هێشتووە ئەگەرماڵی هەبوو ، ئەگەر ماڵیشی نەبوو خەزێنەی موسڵمانان بۆی ئەکات ئەگەر ئەویش نەبوو خێر خوازێك بۆی بکـات ئەگەر هەرئەویش نەبوو ئـەوا کۆمەڵی موسڵمانان بـەخێری خۆیـان بۆی ئەکەن ٠

ئینجا ئەو کفنانەی کەباسمان کردن یەك لەسەریـەك دائەخرێن و مردووەکـەیان تیـا ئەپێچرێتەوە ، وەســەرەوخوار ئەبـەسترێ وەك پشتوێن ئینجا کەخرایە ناوگۆڕەکەوە ئەبێ بە سـتراوەکان بکرێنەوە ٠

پێویستە مردوو زووببرێ بۆگۆڕستان وە ئەبێ مووسڵمانان بەشداری بکەن لەکاتی بردنی بۆگۆڕستان٠باش وایە خەڵکەکە لەبەر دەمیەوە لەنزیك مردوەکە بڕۆن بەڕێوە وە سڵاوات بدەن لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر ــ صلى الله عليه وسلم ــ وەلەدوای ناشتنی هەرکەسێ بۆخۆی دوعای خێری بۆبکات ٠

بێگومان مردوو ئاگادارە بەڕۆیشتنی ئەو خەڵکە لەگەڵیدا ،چونکە پێغەمبەر ــ صلى الله عليه وسلم ــ جارێکیان ئامادەی ناشتنی مردوویەك بووکاتی گەڕانەوە فەرمووی « تەقەی ئەعلەکانمان ئەبیستێ ئەم مردووە »٠

# چۆنیەتی بەجێهێنانی نوێژی مردوو

نوێژی مردوو فەرزی ـ کیفایە ـ یە واتە کۆمەڵی موسلمانان هەموویان بەرپرسیارن لەنەکردنی نوێژی مردوو بەڵام ئەگەر یەکێك لە موسلمانان نوێژەکەی کرد فەرزەکە لەسەر ئەوانی تر لائەچێت .

نوێژی مردوو بەم جۆرە ئەکرێت :

ئەبێ مردووەکە لەبەردەم نوێژ کەرەکە دا بێت ، نوێژ کەرەکە لەپشتی مردووەکەوە ڕوو بەقیبلە ئەوەستێ وئەڵێت :

نیەتم هەیە نوێژی ئەم مردووە ئەکەم بەفەرزی ـ کیفایە ـ بۆخوا ـ الله اکبر ـ ئینجا سورەتی فاتیحە ئەخوێنێ ودووبارە دەستی بەرزئەکاتەوە وئەڵێت ـ الله اکبر ـ ئینجا سڵاوات ئەدات لەسەر پێغەمبەر بەم جۆرە :

« اللّهم صَلّ علی محمد وَعلی آلِ محمد کما صَلّیتَ علی ابراهیم وعلی آل ابراهیم وَبارِك علی محمد وَعلی آلِ محمد کما بارَکتَ علی ابراهیم وَعلی آلِ ابراهیم في العالمین انكَ حمیدٌ مجید » ئینجا دووبارە دەست بەرز ئەکاتەوە وئەڵێت ـ الله اکبر ـ ئینجا دووعا ئەکات بۆ مردووەکە بەم جۆرە : « اللّهم اغفر لِحَیّنا وَمَیّتِنا وَشاهِدِنا وَغائِبِنا وَصَغیرنا وکبیرنا وَذَکَرِنا واُنثانا اللهم مَن اَحْیَیْتَهُ مِنّا فأحیِهِ علی الاسلام وَمن تَوفّیتَهُ مِنّا فَتَوفّهُ علی الایمان اللهم اغفِر لَه وارْحَمْهُ » ئینجا ئەم جارەش دەست بەرزئەکاتەوە بۆ ئاستی شانیو ـ الله اکبر ـ ی چوارەم ئەکات لەدوای کردنی ـ الله اکبر ـ ی چوارەم پێش سەلامدانەوە ئەم پاڕانەوەیەش ئەخوێنرێت : « اللهم لا تَحرِمنا اَجْرَهُ ولا تَفْتِنا بَعْدَهُ واغفر لَنا وَلَه » ئینجا سەلام ئەداتەوە وەکو سەلام دانەوەی نوێژەکانی تر بەڵام ئەگەر مردووەکە

منداڵ بوو ئـەم پاڕانەوەیەش ئـەخوێنرێت : « اللهم اجعَلْهُ فَرَطاً لِأَبَوَيهِ وسَلَفاً وَذُخراً وَغِبطَةً واعتباراً وَشَفيعاً وثَقِّلْ بِهِ موازينهما وافرِغْ الصبر على قلوبهما » بێگومـان ئـەگـەر مردووەکـە مێینـە «مؤنث» بوو ئـەبێ ڕاناوەکـان «الضمـائر» بگۆڕێن بۆمێینـە بۆنمونە لـەجیـاتی ڕاناوی « لَـهُ » بووترێت « لَهـا » وەهـەروەهـا بۆئەوانی تریش ٠

# نوێژی ڕێبوار

« يُريدُ اللهُ بِكُمُ اليُسرَ وَلا يُريدُ بِكُمُ العُسرَ »

لە کاتێکدا کە کەسێك بچێت بۆڕێگایەکی حـەڵای دوور ئەتوانێت نوێژەکـانی کورت بکاتـەوە ، وەکـورت کردنـەوە تـەنهـا لـەنوێژە چوارڕکاتی‌یەکاندا ئەکرێت واتە نوێژی « نیوەڕۆو عەسرو خەوتنان » کورت کردنەوەش ئەوەیە لەجیاتی نوێژەچوار ڕکاتی یەکان دوو ڕکات بکرێت وەلەنوێژی «ئێوارەو بەیانیاندا» کورت کردنەوەنی‌یە ٠

ئەگەر کەسێك لەشارێکەوە یان لەدێیەکـەوە بەڕێکەوت ئـەوە دەست پێکردنی گەشتەکەی لەسەرەتای دەست پێکردنەوە لەسنووری شارەکە یان دێکەوەیە ٠ ئەگەر کەسێك لەگەشتەکەیدا نیەتی وابوو لەو جێگایە دائەنیشێ کەبۆی ئەڕوات هەتا چوار ڕۆژبۆی هەیـە نوێژ کورت بکاتـەوە ، کاتێ گـەیشتەجێ وەڕۆژی چوونی بۆئەو شوێنـە وەڕۆژی گەڕانەوەی لەو شوێنە لەچوارڕۆژەکە ناژمێررێت ٠ ئەگەر لەو شوێنە بەنیازی گەڕانەوە دانیشت واتـە هـەرکاتێك ئیشەکەی بۆبێك هـات بگەڕێتەوە ئـەوە هـەتا ـ١٨ـ هـەژدە ڕۆژ کورت کردنـەوەی نوێژی بۆدروستە ٠

بەلای هەندێ لەزانایانی «شەرع»ە وەئەم هەژدە ڕۆژە بۆکەسێکە کەبۆ شەڕکردن بچێت نەك کەسێك بۆ بازرگانیو شتی تربڕوات ئـەوە تاچوار ڕۆژ بۆی دروستە بەڵام ئەگەر زانی لە چوار ڕۆژ زیاتر ئەمێنێتەوە

ئەوە کورت کردنەوەی بۆنی یە ئەورێگا دوورەی کە دروستە نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە ـ ٤٨ میلی هاشمیە هەرچەندە ئەم ماوەیەش بەکاتێکی کەم ببڕێت • لەبەر ئەوەی نوێژ کورت کردنەوە بار سووك یەکە لەلایەن خواوە بۆ بەندەکانی •

ئەوکەسەی کەنوێژ کورت ئەکاتەوە ئەبێ لەسەرەتای گەشتەکەیەوە مەبەستی جێگایەکی دیاری کراوبێت کەواتە کەسێك بێ مەبەستو دیاری کردنی جێگایەکی زانراو بکەرێت وەکو گەڕۆك «سیاح» کورت کردنەوەی نوێژی بۆنی یە •

ئەگەر کەسێك سەرباز بوو بەفەرمانی گەورەکەی ڕۆیشت بۆ شوێنێك نەی زانی بۆکوێ ئەچێ وەرێگا کەشی مەرجی کورت کردنەوەی تیا بوو دروست نی یە سەربازەکە نوێژ کورت بکاتەوە بەلام ئەگەر سەربازەکەنیەتی ماوە کورت کردنەوەی هێنا ئەو کاتە دروستە بۆی نوێژی تیا کورت بکاتەوە •

ئەگەر کەسێك ڕێگایەکی دووری گرتە بەر پێش ئەوەی بگاتە جێ نیەتی گەڕانەوەی هێنا ئەوە کورت کردنەوەی بۆنی یەو گەشتەکەی کۆتایی دێت ، ئەگەر نیازەکەی گۆڕی وەبە ڕێ کەوت بۆ ئەو جێگایە ئەوە سەرەتای ڕێگا بڕینێکی تازەیە لەوێوە سەرەتای گەشتەکەی بۆ دائەمەزرێتەوە •

ئەگەر ئافرەتێك بەبێ فەرمانی مێردەکەی چوو بۆ گەشتێك کورت کردنەوەی نوێژی بۆنی یە ، ئەو کەسەی کەنوێژ کورت ئەکاتەوە نابێ لەدوای «لەپشتی» کەسێکەوە نوێژ بکات کەئەو کەسە نوێژ کورت نەکاتەوە ، بەلام دروستە لەپشتی کەسێکەوە نوێژ بکات کەئەویش نوێژەکانی بەکورت کردنەوە بکات وەپێویستەو بەمەرج دانراوە بۆکورت کردنەوەی نوێژ لەکاتی نوێژ دابەستندا لەگەل ووتنی «الله اکبر»دا نیەتی کورت کردنەوە بهێنێت وە کورت کردنەوەی نوێژ لەگەشتا خێری زیاترە لەتەواو کردنی نوێژ •

# کۆکردنەوەی نوێژەکان

کۆکردنەوەی نوێژەکانی نیوەڕۆو عـەسر دروستە پێش بخرێت‌یان دوابخرێت پێش خستنی ئەوەیە نوێژی عەسر بهێنی بۆلای نوێژی نیوەڕۆ، دواخستنیشی ئەوەیە نوێژی نیوەڕۆ بەرێت بۆلای نوێژی عەسر وەهەروەها لەنوێژی ئێوارەو خەوتنانیشدا کۆکردنـەوە دروستە بەمەرجێك کـەئەو ڕێگایە لەدوو قۆناغ کەمتر نەبێت بێگومان کۆکردنـەوەی نوێژ بۆکاتی بڕینی ڕێگایەکی دوور ئەبێت ٠

بۆ دروست بوونی پێش خستنی نوێژ سێ مەرج پێویستە :

١ ـ لەپێشەوە دەست بکـات بەنوێژی یەکـەم ئەگـەر هـەردوو نوێژەکەی کردو بۆی دەرکەوت نوێژی یەکەمی بەتاڵ بووە ئەوا نوێژی دووەمیشی بەتاڵ ئەبێتەوە ئەبێ هەردوو نوێژەکە بکاتەوە ٠

٢ ـ نوێژ کەر ئەبێ نیەتی کۆکردنەوەی هەردوو نوێژەکە بهێنێت وەجێگای ئەونیەتەش سەرەتای نوێژی یەکەمیان بێت ٠

٣ ـ «مەوالات» واتەکاتی زۆر نەخاتە نێوان هەردوو نوێژەکەوە با بیانوو شی «عوذر» هەبێت وە لەکردنیاندا بەشێوەی یەك نوێژبن ئەگەر کاتی زۆرکەوتە نێوان هەردوو نوێژەکـەوە با بیانووشی هـەبێت ئـەوە پێویسـتە نوێژە دووەمەکـە دوابخرێت بۆکـاتـی هـاتنـی نوێژەکـە وەکۆکردنەوەی بۆنابێ ٠

ئەگەر کەسێك بەتەیـەموم نوێژ بـکات کورت کردنەوە شی بـۆ دروستە ، ئەگـەر یـەکێ دوونوێژی کۆکردەوە لـەدواییدا زانی کـە پایەیەکی لەنوێژی یەکەم نەکردوە ئەوە هەردوو نوێژەکەی بەتاڵ ئەبنەوە ئەبێ سەر لەنوێ هەردوو نوێژەکانی بەکۆکراوەیی بکاتەوە ٠

لەکاتێکدا ئەگەر نوێژی یەکەم برا بۆلای نوێژی دووەم ئەوکاتـە تەرتیبو ڕیزکردنو یەك لـەدوای یەكو نیـەتی کۆکردنـەوە پێویست نی‌یە ، بەڵام دواحستنی نوێژی یەکەم بەنیەتی کۆکردنەوە لەگەڵ نوێژی دووەمدا پێویستە نوێژی یەکەم کاتەکەی ڕانەبووردووبێت ٠

## نوێژی ویستەفەڕی «صلاة الاستخارة»

ڕەوشتی خاوەن باوەڕوایە لـە هـەموو ڕووداوێکی ژیانیدا پشت ئەبەستێ بەهێزو دەسەڵاتی پەروەردگاریەوە ، باوەڕی وایـە هـەرچی ویستی خوای لەسەر ئەبێ ڕوونادات بەسەرژیانیدا ، کاتێك ڕووداوێکی ناسۆر ڕووی تێ بکات یـەکسەر خۆی ئـەگەیێنێتە مەڵبـەندی چـارە سەرکردنی ئەو نەخۆشی‌یە دەروونیانەی کەتووشی بوون ئەویش بریتی‌یە لەهەڵگرتنی دەست نوێژو چوونە ناو نوێژەوە ٠

پێغەمبـەری پێشەوامان ـ صلى الله عليـه وسلم ـ هـەر کاتێـك ڕووداوێکی ناسۆری تووش بووبێت خێرا دەستی کردوە بـەنوێژکردن چونکە نوێژ کردنی ڕاستی هەموو تەنگو چەڵەمەیـەکی ناسۆرو ئێش‌و ئازارێکی تا هەموار لەیادی خاوەن باوەڕئەباتەوە ٠ ئەگەر خاوەن باوەڕ داخوازی یەکی هـەبوو بیـەوێ لـەخوای گـەورەی بخوازێت ئـەبێ لەسـەرەتای داخوازی یەکـەیەوە پەیوەندی بـکات بەپەروەردکاریـەوە بەدابەستنی نوێژ ٠ بۆیە پێغەمبەری خۆشەو یستمان ـ صلى الله عليه وسلم ـ ڕێگای فێرکردوین بۆداوا کردنی داخوازی یەکانمـان وەبـەم شێوەیە فەرموو یەتی :

« عَنْ ـ جابر بن عبدالله ـ رضي الله عنهما ـ قال : كان رسول الله ـ صلى الله عليـه وسـلم ـ يُعَلِّمُنا الاستِخارة في الأمـور كمـا يُعَلِّمُنا السـورة مِـنَ القـرآن ٠ يقول : إذا هَمَّ أحَدُكُمْ بالأمر

فَلْيَرْكَعْ رَكعتين ثُمَّ لِيَقُلْ : اللّهُمَّ إنّي أستَخيرُكَ بِعِلْمِكَ وَاستَقدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ واسألُكَ مِنْ فَضْلِكَ العَظيم فأَنّكَ تَقدِرُ ولا اقْدِرُ وتَعلمُ ولا أعْلمُ وَأنتَ عَلامُ الغُيُوبِ • اللّهُمَّ إنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أنَّ هذا الأمر خيرٌ لي في ديني وَمَعاشي وَعاقِبةِ أمْري فاقدِرهُ لي وَيَسّرْهُ لي ثمَّ بارِكْ لي فيهِ وإنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أنَّ هذا الأمرُ شَرٌ لي في ديني وَمعاشي وعاقبة أمْري فاصْرِفْهُ عَنّي واصْرِفني عَنْهُ واقدرْ لي الخَيرَ حَيْثُ كانَ ثمَّ أرضِني بِهِ – قال ويُسَمّي حاجَتَهُ – » •

واته : لەجـابیری کوڕی عـەبدوللاوە ـ ڕەزای خـوایـان لێ بێ ـ گێڕراوەتەوە فەرموویـەتی پێغـەمبەر ـ صلى الله عليـه وسلم ـ فێری نوێژی « ویستە فەڕی = داخوازی چاکە »ی ئەکردین بۆ فەرمانێك کە مەبەست بێت هەروەکو چۆن فێری سورەتێك لەقورئانی ئـەکردین • پێی ئەفەرموویـن هەرکاتێك خەیاڵی کردارێکتان کرد دووڕکات نوێژ بکەن بەنیەتی سوننەتی «ئیستیخارە»وە لەدوای نوێژەکە ئەم پاڕانەوە یەبخوێنن « ئەی خوایـە من داوات لێ ئـەکـەم سینەم گوشادبکـە بەچۆنیـەتی ئەونیـازەی والـەدڵمدا چونکـە هەرزانیـاری تۆیـەشارە زای هـەموو کردارێکە ، وەداوا لە تۆئەکەم فەڕوپیرۆزی ئەم کارەم بۆ دیاری بکەیت وە داوا لەگەورەییت ئەکەم چونکە تۆ ئەی خوایە بـەدەسەڵاتی بـەسەر هەموو کارێکدا منی بەندە بێدەسەڵاتو نەزانم ، ئاگاداری هەموو شتێکی منی ، منی بەندە بێ ئاگام مەگـەر بەزەیی تۆ ئاگادارم بـکات ، وە تۆ زانای هەرەبەرزی پەنامەکی یەکانی ئەی خوایە : ئەگەر تۆ ئەزانی ئەم داخوازی یەم فەڕو پیرۆزی پێوەیە بۆ ئایینموە بۆ ژیانم وەبۆ پاشەڕۆژم بۆم دیاری بکـە ، وەبۆم ئاسـان بکـە ، لـەپاشـان خۆشییو هێمنـی تیادیاری بکە • وەئەگـەر ئـەزانی ئـەی خوایـە ئـەم داخوازیەم بێ

سوودو هەلەیە بۆناییینەو زیانەو پاشەڕۆژم،لێمی دوور خەرەوە ،وەمنیش لەو بەدوورکە وەبۆم دیاری بکە شتێك ئەڕو پیرۆزی تێدابێت وەڕازیی،و دلنیام بکە لەوشتەی کەپێم ئەبەخشی » ٠

لەدوای تەواوبوونی داخوازی پاڕانەوەکە ئەبێ ناوی داخوازی یەکە ببرێت ئیتر ئەگەر خوای گەورە ئارەزووی لێ بێت داخوازی یەکە جێ بەجێ ئەکات ٠

## کڕنووش بردن «السجدة»

گەورەترین‌و بەرزترین بەندایەتی بەندە بەرامبەر بەپەروەردگاری کڕنووش بردنە ، چونکە ئادەمیزاد کاتێك دەم‌و چاوی نایە سەرزەوی بەنیازی کڕنووش بردنەوە نیشانەی هەموو بێ دەستەلاتی یەکە بەرامبەر بەخوا ٠

ئەگێڕنەوە لە ـ ئەوبان ـەوە فەرموویەتی : بیستم لەپێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەیفەرموو : « عَلَيكَ بكثرة السجود فانّكَ لَنْ تسجد لله سجدة إلاّ رَفَعكَ الله بها درجة وحَطّ بها عنكَ خطيئةً »(٧٠) واتە : لەسەر تۆبێ کڕنووش بردنی زۆر ، تۆنیت هەر کاتێك کڕنووش بەریت بۆ پەروەردگارت ٠ پلەت پێ‌ی بەرز بێتەوەو تاوانت لەسەر لاچێ ٠ وە هەروەها لە ـ ئەبی هورەیرەوە ـ ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرموویەتی : « أقرب مایکون العبد من ربه وهو ساجد فاکثروا الدّعاء »(٧١) واتە : نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگاریەوە کاتی کڕنووش بردنە کەواتە زۆر بپاڕێنەوە لەکاتی کڕنووش بردندا ٠

---

٧٠ ـ رواه احمد ومسلم وأبو داود ٠

٧١ ـ رواه احمد ومسلم وأبو داود ٠

# بەشەکانی کڕنووش بردن

١ ـ کڕنووش بردنی نوێژەکان : وەکو لەوەو پێش لەباسی نوێژەکاندا باسمان کرد ٠

٢ ـ کڕنووش بردنی لێ‌تێك چوون « سجدة السهو »و هەڵەکردن لەنوێژدا پێش ئەوەی سەلام بدرێتە وە لەنوێژدا دوای خوێندنی تەحیات دوو کڕنووشی لێ‌تێك چوون ئەبرێت هەرووەکو کڕنووشی نوێژ وەکو لەپێشەوە باسمان کرد لەم کڕنووشەدا ئەوترێت : « سُبحانَ الذي لا يَسهوا ولا يَنام » ٠

٣ ـ کڕنووشی سوپاس کردن « سجدة الشکر » : کاتێك ئەم کڕنووشە ئەبرێت کە نازو نیعمەتێکی پەروەردگارت تووش بووبێت : « عَن ـ أبي بكر ـ رضي الله عنه ـ ان النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ كانَ إذا اتاهُ امرٌ يَسُرُّهُ اوْ بُشِّرَ بِهِ خَرَّ ساجداً شكراً لله تعالى »(٧٢) واتە : ئەبوبەکر ـ ڕەزای خوای لێ‌بێ ـ بۆمان ئەگێڕێتە وەکەپێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ هەرکاتێك فەرمانێکی ئاسمانی بۆ بهاتایە پێ‌خۆش‌حاڵی بکردایە یامژدەی تیابوایە کڕنووشی سوپاسی ئەبرد بۆپەروەردگار ٠

٤ ـ کڕنووشی ڕێز لێ‌گرتن : کە خوا لەقورئاندا باسی کردوە ئەو کڕنووشە بوو کە فریشتەکان بردیان بۆ ئادەم پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ٠

٥ ـ کڕنووشی خوێندنی قورئان « سجدة التلاوة » : بردنی ئەم کڕنووشە سوننەتە بۆ قورئان خوێن وئەو کەسەش کە گوێی لەخوێندنی بێت : « روي عن ـ ابن عمر ـ رضي الله عنهما ـ قال : كان رسول

---

٧٢ ـ رواه الخمسة إلا النسائي ٠

الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ يقرأ علينــا القرآن فاذا أمرّ بالسجدة كبّر وسَجَد فَسَجَدنا »(٧٣) واته : ئەگێڕنەوە لە ـ کوڕی حەزرەتی عومەرـەوە ـ ڕەزای خوایان لێبێ ـ فەرموویەتی پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ قورئانی ئەخوێندەوە بەسەر ئێمەدا هەر کاتێك فەرمان بەرایە بەکڕنووش بردن لەئایەتــەکانی قورئاندا پێغەمبەری خوا « الله اكبر »ی ئەکردو کڕنووشی ئەبرد ، ئێمەش کرنووشمان ئەبرد لەگەڵیا ٠

ئەو شوێنانەی کە پێویستە لەکاتی خوێندنی قورئاندا کڕنووشیان تیا ببرێت ـ١٥ـ شوێنە لە قورئانی پیرۆزدا ٠

لەکاتی خوێندنی قورئاندا هەرکاتێك قورئان خوێن یان گوێ گری قورئان گەیشتە یەکێك لەوشوێنانە پێویستەکڕنووشی قورئان خوێندن ببەن قورئان خوێنو گوێ گری قورئان ٠

وەئەمانەی خوارەوەش ئەو شوێنانەن :

---

٧٣ ـ رواه ابو داود ٠

١ ـ سورەتی ـ الرعد ـ ئایەتی ـ ١٥ ـ
٢ ـ سورەتی ـ النحل ـ ئایەتی ـ ٤٩ ـ
٣ ـ سورەتی ـ الأعراف ـ ئایەتی ـ ٢٠٦ ـ
٤ ـ سورەتی ـ الاسراء ـ ئایەتی ـ ١٠٧ ـ
٥ ـ سورەتی ـ مریم ـ ئایەتی ـ ٥٨ ـ
٦ ـ سورەتی ـ الحج ـ ئایەتی ـ ١٨ ـ
٧ ـ سورەتی ـ الحج ـ ئایەتی ـ ٧٧ ـ
٨ ـ سورەتی ـ الفرقان ـ ئایەتی ـ ٦٠ ـ
٩ ـ سورەتی ـ النمل ـ ئایەتی ـ ٢٥ ـ
١٠ـ سورەتی ـ السجدة ـ ئایەتی ـ ١٥ ـ
١١ـ سورەتی ـ ص ـ ئایەتی ـ٢٤ ـ بەلام بەلای پێشەوا ـشافیعی‌یەـ
وە ئەمە سوجدەی ناوێ چونکە سوجدەی شوکرە
١٢ـ سورەتی ـ فصلت ـ ئایەتی ـ ٣٧ ـ
١٣ـ سورەتی ـ النجم ـ ئایەتی ـ ٦٢ ـ
١٤ـ سورەتی ـ الانشقاق ـ ئایەتی ـ ٢١ ـ
١٥ـ سورەتی ـ العلق ـ ئایەتی ـ ١٩ ـ

ئەو دوعاو پاڕانەوەیــە ش لــەکاتی کڕنووشی قورئــان خوێندندا ئەووترێت ئەم دوعایەیە کە حەزرەتی ـ عائیشە ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ ئەفەرمووێت پێغەمبەر ـ صلى الله علیه وسلم ـ لە کڕنووشی قورئاندا خوێندندا ئەیفەرموو: سجد وجهي للذي خلقه وشقّ سَمعه وبصره بحَوله وقوّته »(٧٤) وە هەروەها ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ـ صلى الله علیــه وسلم ـ لەکاتی کڕنووشی قورئاندا خوێندندا ئەم دوعایەی فەرمووە: «اللهم احطط عني بها وزرا واكتب لي بها اجرا واجعلها لي عندك ذخراً » .

وەلەکاتی کڕنووش بردنی سوپاسیشدا « سجدة الشكر » ئــەم پاڕانەوە ئەخوێنرێت : « اللهــم لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ اسْلَمْتُ سجد و جهي للّذي خلقه وصَوَّرَهُ وشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَره تَبارَكَ الله أحسن الخالقين » .

وآخِرُ دَعْوانا ان الحَمد لله رَبِّ العالمين .

جمادى الأولى ١٤٠٥

شـــباط ١٩٨٥

---

٧٤ ـ رواه الخمسة إلا ابن ماجة .

# سەرچاوەکان

١ ـ قورئانی پیرۆز •

٢ ـ صحیح البخاری •

٣ ـ مُغني المحتاج

٤ ـ روح الصلاة

٥ ـ وەهەندێ سەرچاوەی تر

# سوپاس گوزاری

لەکانگای دڵمەوە پڕبەدڵ سوپاسی برای بەرێزم کاك (عزیز حافظ نذیر) ئەکەم کەئەرکی سەرپەشتی کردنی لەچاپدانی ئەکتێبەی گرتەئەستۆی خۆی • لەخوای گەورە ئەپاڕێمەوە کەپاداشتی بداتەوە بەبەهەشتی بەرینی خۆی (ئامین) •

(عبدالرحمن طه فتح‌المبین)

# ناوەرۆك

# ناوەرۆك

# ناوەرۆك